## لەسەر ئەرکی پەرلەمانتاری کوردستان

## ( سالار مەحمود )لەچاپدراوە




ناوی کتێب: پەروەردەو فێربوون، گرفت و گۆڕان

نووسەر: صباح عەلی جاف

بابەت: پەروەردەیی

بەرگ و ناوەوە: ئەکرەم محەمەد

پاکنووس: ئازاد عوسمان

تیراژ: (٥٠٠) دانە

## ناوەڕۆک

# پێشەکی

پەروەردە و فێربوون دەرگای ئاشناکردنی مرۆڤە بە ژیان بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی تەندروست بژی و کورد گۆتەنی خوێندن چاوی مرۆڤ دەکاتەوە و لە ژیانی هەر کۆمەڵگەیەکدا خوێندن و خوێندەواری رۆڵی کاریگەر دەبینن ، لە کوردستاندا بە جۆرێك لە جۆرەکان بە هۆکاری زۆر رۆڵەکانی ئەم نەتەوەیە لە قەومەکانی تر زیاتر لە کاروانی پەروەردە و فێربوون بە جێماوترن بۆیە تائێستایش سێکتەری پەروەردە لە قەیراندایە یان بلێین جگە لە کوردستانی باشور تا ئێستایش خوێندن و پەروەردە و فێربوون لە پارچەکانی تر بە زمانی زگماك قەدەغەیە .

کارکردن بۆ قسە کردن لەسەر پەروەردە و فێربوون بە شێوەیەکی زانستی ئامانجدار لە کوردستان تازە و بە هۆی گۆڕانی بەردەوامی ئەم کەرتەیشەوە بابەتەکان پێویستیان بە هەوڵدانی زیاتر هەیە بە تایبەت دوای ئەوەی وەزارەتی پەروەردە و خوێندنی باڵا وەك دوو دەزگای پەیوەندیدار هەوڵی ریفۆریان لە بوارەکەدا داوە بۆیە پێویستە بیرۆکە و پرۆژەکان و گۆڕانکاریەکان گفتوگۆی زۆری لەسەر بکرێت ، ئەم هەوڵەی منیش بەو ئاراستەیەیە بۆ ئەوەی بیرو رای تایبەتی خۆم وەك





کارەکتەرێکی بوارەکە بە شێوەیەکی تا رادەیەك زانستی بخەمە روو .

ئەم کتێبە خوێندنەوەی منە بۆ کەرتی پەروەردە و فێربوون و زۆرێك لە بابەتەکانم لە رۆژنامە و گۆڤارە کوردیەکانی وەك ( کوردستانی نوێ ، هاولاتی ، ئاسۆ ، گەرمیانی ئەمڕۆ ، گۆڤاری هەفتانە ) دا بلاو کردەوەتەوە کە گرنگی خۆی هەیە بۆ ئەو کەسانەی گرنگی بەم بوارە دەدەن بە تایبەت هەندێك لەو بابەتانەی کە پەیوەندی بە روداوێکی دیاری کراوەوە هەیە بە تایبەت لە رووی مێژووی نوسینی بابەتەکە ، زۆرێك لەم بابەتانەم لە گۆشەیەکی پەروەردەیی بە ناوی ( کلاس ) لە رۆژنامەی گەرمیانی ئەمڕۆدا بلاو کردەوەتەوە .

لێرەدا سوپاسی هەموو ئەو کەسانە دەکەم کە هاوکارم بوونە لە لەچاپدانی ئەم کتێبەدا بە هیوام بابەتەکانی ببێتە مایەی بەرەو پێشەوەچونی پەروەردە و فێربوون لە کوردستان و خەمخۆران لە حوکمەت و پەرلەمان رەخنەکان بە بنیاد نەر وەر بگرن و دوای لێبردنیشم هەیە لەوەی کە هەڵەیەك لەو رووە هەبێت چونکە وەك ووتم ئەم سێکتەرە بەردەوام لە گۆڕاندایە بە تایبەت لە ئەمڕۆی سەردەمی تەکنەلۆجیادا .

**سەباح عەلی جاف**

**شوباتی ٢٠١١ – کەلار**

## پۆل

وشەی پۆل ( class ) ی ئینگلیزیی، یەکەم جێگەی پەروەردە یان ژینگەیە کە هەریەکە لە قوتابی و مامۆستا پێی ئاشنا دەبن و بە درێژایی ژیانی پەروەردەیی لای ئەو دوو کارەکتەرە رۆڵی دەبێت .

کلاس یان پۆل یان ئەو ژوورەی کە مامۆستا و قوتابی و پرۆگرام کۆدەکاتەوە، لە کوردستاندا مێژوویەکی تا رادەیەك کۆنی هەیە و رەنگە خوێندن لە حوجرەکاندا بۆ ئەو مێژووە راستر بێت و تا ئێستاش پۆلەکان توانیویانە ئەو سێ کارەکتەرە سەرەکیەی کایەی پەروەردە و فێربوون لەیەك زیاتر ئاشنا بکەن و هەموان لە ژیانی تەلەبایەتیدا چەندین یادەوەریمان لەگەڵ کلاسەکانی قوناغە جیاجیاکانی خوێندندا بە خۆشی و ناخۆشیەوە هەیە .



پەروەردەو فێربوون، گرفت و گۆڕان

کلاسەکان لە کوردستان بە هەزاران نەوەیان لە شار و گوندەکان لە قوناغە جیاوازەکانی مێژوودا پێگەیاندووە و ئێستا و ئەوساشی لەگەڵدا بێت کەڵەپیاوانی کورد لەو پۆلانەدا پێ گەیشتون کە خزمەتیان لە هەموو لایەنە جیاوازەکانی ژیاندا کردووە. رەنگە خوێندنەوەی ئێمە بۆ کلاسەکان جیاواز بێت بەو پێیەی هەر یەکێك لە ئێمە بە خۆش بێت یان ناخۆش لە پۆلەکاندا ژیانی تەلەبایەتیمان بەڕێکردووە .

کلاس لە ئێستای پەروەردە و فێربوندا لە چاو جاراندا گۆڕانی زۆری تێدا کراوە، چونکە کلاسی جاران لە سەربازگە دەچوو و ژینگەیەك بوو بۆ ترس و تۆقان، زیاتر کار لەسەر فێرکردنی بە زۆر لەو ژینگەیەدا دەکرا، بەڵام ئێستا کلاسەکان گۆڕاون و هەوڵ دراوە ساڵ بە ساڵی خوێندن گۆڕانی تێدا بکرێت و ئێستا قوتابی هەست بەوە ناکات کە سەرباز بێت و مامۆستایش کەسێکی ترسێنەر و بە زۆر فێر بکرێت، سەرەڕای گۆڕانەکان، کلاسەکانی ئەمرۆ بە دەر نین لە کەموکورتی سەردەمیانە و پەروەردەیی، ئەمە سەرباری ئەوەی جمەیان دێت لە قوتابی و هەر ئەوەشە وایکردووە کە پۆلەکان ئەوە نەبن کە سەد لە سەد گونجاو بن .

## قوتابی یان خوێندکار

وشەی قوتابی pupil کە خوێندکاریشی پێ دەوترێت، ئەو کەسەیە کە لە تەمەنی شەش ساڵی دەخرێتە بەر خوێندنی قوناغی بنەڕەتی لە ئێستادا و لە هەندێکی جێگەی کوردستان پێش ئەو تەمەنە دەخرێتە بەر قوناغی باخچەی ساوایان . ئەم وشەیە (قوتابی) رەنگە لە کیتابیەوە وەرگیرابێ کە لە سەردەمی عوسمانیەکاندا ئەو مندالآنەی دەچونە بەر خوێندن بە کیتابی ناو دەبران و پاشتر وشەکە گۆڕاوە بۆ قوتابی. بۆ وشەی (خوێندکار) کە بەواتای ئەوە دێت ئەو کەسە بەردەوام لە جوڵەدایە و تەنانەت خوێنیشی لە کارکردندایە تا رادەیەك ئەم وشەیە لە مێژووی پەروەردە و فێربوندا لە کوردستان تازەیە کە بە بڕوای من حەق وایە ئەم دوو وشەیە سودی لێ ببینرێ بۆ قوناغەکانی تەمەنی قوتابی لە کاتی خوێندندا، وەك چۆن لە زمانەکانی تردا وەك زمانی عەرەبی ( تلميذ ) بۆ قوناغی سەرەتایی و (طالب) بۆ قوناغی سەرووتر بەکار دێنن، بەو شێوەیە وشەی قوتابی بۆ قوناغی بنەڕەتی و خوێندکاریش بۆ



◆ پەروەردەو فێربوون، گرفت و گۆڕان

سەروو تر بەکار بهێنرێت کە ئەمەیش پێویستی بە یاسایەك هەیە کە دەزگایەکی زانستی فەرهەنگی بڕیاری لێ بدات و بە یاسا بچەسپێرێت . لە سیستەمی پەروەردەو فێربوون لە عێراق و کوردستاندا، پێشتر ئەم زاراوەیە بە شێوەیەکی رەق مامەڵەی لەگەڵدا دەکرا و دەبوو قوتابی بە هەر شێوەیەك بێت فێر بکرێت و تەنانەت ئەو وتە لەو کاتەدا زۆر باو بوو کە ( گۆشتەکەی بۆ تۆ، ئێسقانەکەیشی بۆ ئێمە ) لە لایەن بەخێوکەرانەوە ئاراستەی مامۆستایان دەکرا، بەلأم رەنگە ئەو شێوازە بۆ ئەو کات گونجاو بێت چونکە تێگەیشتنی گشتی بۆ خوێندن لە ئاستێکی کەمدا بووە و ئەم مامەڵە کردنە زۆر جاریش گرفتی بۆ پەروەردە دروست کردەوە و رەنگە زۆر جار ئەوەمان بیستبێت کە تاکێك بە هۆی توندوتیژیی مامۆستایەکەوە وازی لە خوێندن هێنا بێت و ئێستایش بە داخەوە باسی ئەو زەمەنە دەکات کە تۆراندویەتی لە مەکتەب .

لە ئێستادا لە کوردستان و بە تایبەت لە سیستەمی نوێی پەروەردەدا، گرنگی و مەفهومی قوتابی جیاواز ترە و تێڕوانینی خودی وەزارەت لەگەڵ جێبەجێکاراندا کە مامۆستایانن، تێڕوانینیان زۆر لێکەوە جیاوازن، چونکە مامۆستایان پێیان وایە کە نابێت بەو شێوەیە مامەڵە لەگەڵ قوتابیدا بکرێت چونکە دەبێت هەموو شتێك بە پێی ژینگە و تێگەیشتنی کۆمەڵگە بێت

نەك بەرنامە و پرۆگرامێك کۆپی بکرێت و بە زۆر پەیست بکرێت و خودی وەزارەتیش سیستەمەکەی خستوەتە کارەوە و شەڕەکە لە نێوان هەر دوو لادا گەرمە.

ئەم سیستەمەی کە ئێستا لە کوردستان کاری پێ دەکرێت و بە سیستەمی سویدی ناسراوە و هێنراوەتە ئێرە، جیاوازییەکی زۆری تیادا روودەدات کاتیچك دەخرێتە بواری جێبەجێکردنەوە، تەنها لێرەدا هەندێك جیاوازای لە نێوان هەر دوو ژینگەکەدا دەخەمە روو، بۆ نمونە: لە سوید لە بواری پەروەردەدا (نزیکەی چل ساڵە ئەو وڵاتە کێشەی سیاسیی نیە، ئەولەویەتی کار کردنی حکومەت بۆ بواری رۆشنبیریە و تاکەکان زۆر گرنگی بە لایەنی رۆشنبیری دەدەن بە جۆرێك کە کاتێك منداڵێك لە دایك دەبێت یەکەم دیاری کە پێشکەشی دەکرێت کتێبێکە بۆ ئەوەی ببێتە یەکەم دیاری کە لە دایك بوونیدا بۆ ژیانی پێی بگات. دەزگای نیشتیمانی بۆ فێرکردن " The National Agency For eduction" لەو وڵاتە دەزگایەکی کارگێڕیە بۆ خوێندن کە سێ ساڵ جارێك پلانێکی هەنوکەیی پێشکەشی پەرلەمان و حوکمەت دەکات بۆ پێشخستنی خوێندنگەکان، بەڵام لە کوردستان لە بواری پەروەردەدا (تا ئێستا کوردستان سەربەخۆ نیە و سیستەمی سیاسی جێگری نیە، گرنگییدانی تاك بە لایەنی رۆشنبیری زۆر لاوازە و منداڵ کە لە دایك دەبێت گرنگی یەکەم بۆ





ئەوەیە کە ئەو منداڵە کوڕە یان کچ! وەزارەتی پەروەردە بڕیاردەری یەکەمە بۆ گۆڕانکاریی لە خوێندنگەکان و شتەکان بە میزاجە نەك ئەوەی کە هەر تازەییەك یان بیرۆکەیەکی پەروەردەیی بچێتە پەرلەمان و لایەنی حکومیی خوێندنەوەی بۆ بکات.

لە سیستەمی تازەی خوێندندا، گرنگیپێدانی قوتابی رون نیە و تا هەنوکەش پۆلەکان جمەی دێت لە قوتابی بە هەموو قوناغەکانەوە و، توندوتیژیش دژیان بەردەوامە. گرنگیپێدانی بەخێوکاران بە رۆڵەکانیان (قوتابی) زۆر لاوازە و بەس ئەوەیە کە منداڵەکانیان لە خۆیان دوور دەخەنەوە. لە ئێستای بواری پەروەردە و فێربوندا کار لەسەر سیستەمی کلاسیك و نوێ دەکرێت، ئەمەیش بۆ قوتابی زۆر خراپە و لایەنی پەیوەندیداریش لە حکومەت و خێزانیش بەرپرسیاری یەکەمن بۆ ئەو تێکەڵی و چەقبەستوییەی پەروەردە، دەبێت پێکەوە هەریەکە لە مامۆستا و قوتابی و خێزان و وەزارەتی پەروەردە، کار بکەن بۆ دروستکردنی قوتابیەکی تەندروست و کارا و پێگەیشتوو بە بەها باڵاکانی کۆمەڵگەی کوردەواریی و پڕ چەك بە زانستی سەردەم بۆ خزمەتکردنی گەل و نیشتیمان لە داهاتودا و واقیعیش لە بەرچاو بگیرێت و پێ بە پێ کار بکرێت، هەروەك لە خوارەوەی هەرەم بۆ سەرەوە کار لەسەر سیستەمەکە

بکرێت نەك بە پێچەوانەوە چونکە هەموو ئەوانە لە پێناو پێگەیشتنی قوتابیەکی پێگەیشتووی سەردەمدایە .

مامۆستا = بە پەروەردە و فێربوون

مامۆستا گیان تۆ لای من پیرۆزی
تۆ لە باوکم زیاتر بۆ من دڵسۆزی
جوان هەست ئەکەم بە زوبانێکی شیرین
پێم ئەبەخشی زانستی خۆت چین بە چین

مامۆستا ( Teacher) یەکێك لە کارەکتەرە گرنگەکانی پەروەردە و فێربوون کە پەروەردەکردنی هەموو نەوەکانی لە هەموو بوارەکانی ژیاندا لە ئەستۆیە، لە جیهاندا بوونی دەگەڕێتەوە بۆ گەشەکردنی ئەقڵی مرۆڤ ، لە کوردستاندا مامۆستا شان بە شانی تاکەکانی تری کۆمەڵگە رۆڵی بەرچاوی هەبووە بۆ پێگەیاندنی نەوەکان و بە درێژای شۆڕش و مێژووی میرنشینەکان مامۆستا هەبووە و خزمەتی کردووە.
ڕەنگە وشەی (مامۆستا) وەك زاراوە لای کورد تازە بێت و مێژووەکەی بۆ سەدەیەك بگەڕێتەوە، بەدیارییکراویی ئەو دوو





دێڕە هۆنراوەیەی شاعیری پایەبەرز "بەختیار زێوەر" نوسیویەتی مێژووەکەی بۆ سەرەتای ساڵی ١٩٤٧ دەگەڕێتەوە کە لە سلێمانی لە ژێر ناوی "مامۆستای دڵسۆز" نوسیویەتی و سی نیوە دێڕی تەواوەتیە کە پێ ناچێت هیچ هۆنەرێکی کورد بەوشێوە جوانە وەسفی مامۆستای کرد بێت و زۆرێك لە ئێمە پێی ئاشناین.

لە کوردستاندا ئەم چینەی کۆمەڵ نیو سەدە زیاترە بیریان گەشەی کردووە و خۆیان رێکخستووە بۆ خزمەتی گەل و نیشتیمان و لە ١٥ / ٥ / ١٩٦٢ یەکەمین رێکخراوی تایبەت بە خۆیان دادەمەزرێن بە ناوی (یەکێتی مامۆستایانی کوردستان) و مامۆستای پایە بەرز "کامیل بەسیر" دەبێتە یەکەمین سکرتێری ئەو رێکخراوە پیشەییە و تا ئێستا ئەو رێکخراوە درێژەی بە خزمەت کردن بە کاروانی زانست و خەبات داوە .

لە سیستەمی کۆن و سەردەمی بەعسدا مامۆستا وەك ئاغا و سەرۆك خێڵ مامەڵەی لەگەڵ منداڵدا دەکرد بەو پێیەی ئاستی پێگەیشتنی پەروەردە لەو دەمەدا هەر ئەوەندە بوو. مامۆستایان لەو سیستەمەدا بە دەیان جیلیان پێ گەیاندووە لە هەموو بوارێکدا، لە ئەمڕۆی سیستەمی نوێی خوێندندا چەمك و ئەرکی مامۆستا گۆڕاوە بە جۆرێك کە دەبێت مامۆستا هاوکار و هاوڕێی قوتابی بێت، بەڵام تا هەنوکەیش تێنەگەیشتن و شەڕی

دەستەویەخە لەسەر ئەم تێگەیشتنە لە نێوان وەزارەت و خودی هەندێك لە مامۆستایان دا هەیە کە پێیانوایە لە سیستەمی تازەدا مامۆستا سوککراوە و زیاتر گرنگی بە منداڵ دەدرێت ئەمەیش بوەتە مایەی سەرئێشە بۆ پەروەردە و فێربوون .

بە پێی ئامارێکی نارەسمی نزیکەی سەد هەزار مامۆستا لە کوردستاندا وانە دەڵێنەوە و بەمپێیەیش هەر پەنجا کەس لە کوردستاندا مامۆستایەکی بەر دەکەوێت.  لە گەرمیاندا نزیکەی چوار هەزار مامۆستا هەیە لە کاتێکدا سنورەکە پێویستی بە زۆرتر هەیە و ژمارەیەك لەو رێژەیش تەنها کار کردنیان بۆ موچە وەرگرتنە، چونکە ئەگەر بەپێی ئەو وتە ئینگلیزییە بێت کە دەڵێت:"مامۆستا لە دایك دەبێت و دروست ناکرێت"، ئەوا گرفتەکە دووبەرابەرە، چونکە لە سیستەمی سویدی لە کوردستاندا پێناسە و مەفهومی مامۆستا روون نیە، بەجۆرێك کە مامۆستا ئامادەو ساز نەکراوە لەرووی پێدانی زانیاری و گۆڕانکاریە نوێیەکانی جیهان لە بواری پەروەردەدا، هەر ئەوەندەیە کە بۆ گۆڕانکاری لە پرۆگرامێکدا خولێکی رۆتین دەکرێتەوە کە وانەکانی خولەکە سەرپەرشتیارە بەڕێزەکان دەیڵێنەوە کە خۆیان پێویستیان بە دەیان خول هەیە و پەیوەندییان لەگەڵ مامۆستای ئامادەبوو زۆر باش نیە .





مامۆستای ئەمرۆ بە سیستەمی کۆن و بە گۆڕانکاریە تازەکانی ئەمرۆ ئاشنا نیە و هەوڵ نادات بۆ خۆ پڕ چەك کردنی لەو رووە، ئەمەش کەرتی پەروەردەی تەواو ئیفلیج کردووە، بەجۆرێك متمانەی پەروەردەیی لای فێرخواز لاواز بووە، بۆ نمونە" (گلێن ستێن هاوس) کە مامۆستایەکی رۆژئاواییەو زیاد لە نیوەی تەمەنی خۆی بۆ خزمەتی پەروەردەی منداڵان تەرخان کردووە، لە کتێبەکەیدا ( Keys to single parenting)  کە زیاتر لە دووسەد لاپەڕە پێکدێت،  لە ئەزمونی خۆی دەدوێت و بە درێژایی باسەکان، باس لە متمانە بەخۆبوون دەکات پێیوایە کە ئەو میراتەی ئێمە بۆ رۆڵەکانمان بەجێی دێڵین هەستی متمانە بەخۆبوونە کە ئێمە لای منداڵەکانمان تا ئێستا دروستمان نەکردووە و لەورووەوە قوتابیەکان بە کەم سەیر دەکەین کە ناهێڵین بە ئازادانە راوبۆچونی خۆیان لەسەر وانەکان دەربڕن و دەبێت دواجار مامۆستا حاکم و تەوەر بێت.

پێویستە لە کوردستان کار لەسەر دوو خاڵی گرنگ بکرێت بۆ بە تەندروست کردنی مەفهوم و کاری پیرۆزی مامۆستا، چونکە ئەوە مامۆستایە کە نەزان لە تاریکی رزگار دەکات و وڵات بەرەو لوتکەی داهێنان دەبات کە بڕوای من لە کوردستان بە تەواوەتی کاری لەسەر نەکراوە. یەکێك لەو خاڵانە خۆشگوزەرانی ژیانی مامۆستایە، بە جۆرێك مامۆستا تەنها بە پیشەی مامۆستاییەوە

خەریك بێت و خۆی بۆ پەروەردە كردنی قوتابیان ئامادە بكات، چونكە كوردستان هەرگیز بەلوتكە ناگات تا جیاوازی لە موچەی مامۆستا و پۆلیس و كارمەندێكی ئاسایش دا نەكرێت. خاڵی دووەم كە بەرای من لەوەی پێشوو گرنگ ترە، ئەویش لایەنی هۆشیاریە كە ئەمەیش سەرەتا بە خودی مامۆستا دەكرێت و دواجاریش بە دامودەزگا پەیوەندیدارەكان لە سەروی هەمویانەوە وەزارەتی پەروەردە و یەكێتی مامۆستایان و زانكۆ و دامەزراوە زانستیەكان بە پلانڕێژیی دوور مەودا لە كردنەوەی خول و وۆركشۆپ و كۆڕ و سیمینار لەسەر تازەكارییەكانی بواری پەروەردە و فێربوون و گرنگییدان بە پسپۆڕیی و زەوقی مامۆستا لە پۆلەكاندا.





### پرۆگرامەكانی خوێندن لە كوردستان و عێراقدا

پرۆگرامی خوێندن ( Program ) یەكێكە لە رەگەزەكانی پەروەردە و فێربوون كە لە هەر وڵاتێكدا فەلسەفەی تایبەتی خۆی هەیە، بەڵام لە ئەمڕۆدا بە جۆرێك لەجۆرەكان هەوڵەكان بەو ئاراستەیەیە كە پرۆگرامێكی ستانداردی جیهانی جێ بەجێ بكرێت. پەیڕەوی خوێندن هەموو ئەو پەرتوك و رێگایانە دەگرێتەوە كە بۆ هەریەكە لە مامۆستا و قوتابیان دانراوە كە لە قوناغەكانی خوێندندا بە زنجیرە دەخوێنرێت و ئامانج لێی، پەروەردە و فێربوونە و خاڵی بەیەك گەیشتنی مامۆستا و خوێندكارە .

رەنگە دانانی پەیڕەوی خوێندن لە عێراقدا بۆ نیوەی سەدەی رابردوو بگەڕێتەوە بە تایبەت لە حەفتاكاندا، حكومەتی ئەوكاتەی بەعس تا رادەیەك بە شێوەیەكی زانستی توانی پرۆگرامەكان دابنێت و زۆرێك لەو پرۆگرامانە بۆ سەر زمانی كوردی وەرگێڕدران و زۆری پرۆگرامەكانی خوێندن هاوشێوەی وڵاتانی عەرەبی بوو كە منداڵانی لەسەر پەروەردە دەكرا.

لە پرۆگرامەکانی پێشوودا بە ئاشکرا بەعس و ئەقڵیەتی ئەو حزبە رەنگی دابووەوە، بە جۆرێك لە سەرەتای هەموو یەکێك لە پەرتووکەکاندا وێنەیەکی سەرۆك کۆمار (صەدام حسێن) دەبینرا و وتەکانی بە نموونە دەهێنرانەوە، ئەمەش کاریگەری خراپی لەسەر قوتابی و مامۆستایان هەبوو، بەڵام لە ئێستاشدا هەمان بۆچون دووبارە بووتەوە لە عێراقی نوێدا و بە پێی راپۆرتێکی "فرانس پرێس" بە ئاشکرا لە پرۆگرامەکاندا جیاوازی مەزهەبی زەق کراوتەوە و ئاماژە بە مەنهەجی پەروەردەی ئیسلامی دەکات کە باس لە چۆنیەتی دەست نوێژ گرتن و نوێژکردنی سوننە و شیعە دەکات کە ئەمەیش جارێکی تر زیندوو کردنەوەی هەمان عەقڵیەتی پێشووترە بە جۆرێك کە وەزارەتی پەروەردەی عێراق لە ئاست چارەکردنی دا دەستە وەستانە .

لە کوردستاندا پەیڕەوی خوێندن دوا بە دوای راپەڕین بیری لێکرایەوە کە گۆڕانی تێدا بکرێت و یەکەمین پرۆگرامێکیش کە گۆڕانی تێدا کرا (مێژوو) بوو، کە بەداخەوە زۆر بە کرچ و کاڵیی و زانیاری هەڵە و کەمەوە دەستی پێ کرد و دواتر هەر دوو ئیدارەی سلێمانی و هەولێر وردە وردە دەستیان بە دەستکاری کردنی پرۆگرامەکانی تر کرد کە مەیش مایەی سەرئێشە بوو بۆ مامۆستایان و قوتابیان. دواجار وەزارەتی پەروەردە لە ساڵی ٢٠٠٧ بڕیاری ریشەیی دا لە پرۆگرامەکان بە هێنانی سیستەمی



پەروەردەو فێربوون، گرفت و گۆڕان

سویدی کە هەمدیس لەم پرۆسەیەشدا هەڵەو کەمو کورتی زۆر هەبوو کە لە قوناغی یەکەمدا بودجەیەکی زۆری بۆ بەهەدەر درا، بۆ نمونە: لە بابەتی زانست و بیرکاریدا کە بە هەردوو شێوەزاری سۆرانی و بادینانی بوو، دواتر هەموو پەرتوکەکان چاپی یەکەمی سوتێنرا و ئەمەیش لە لای مامۆستایان زیاتر بە بابەتێکی بازرگانی لێك درایەوە نەك پەروەردەیی؟

لای هەموان ئاشکرایە کە گۆڕانکاریی پرۆگرامەکان لە پۆلە بنەڕەتیەکانەوە دەستی پێکرد کە هەموو بابەتەکانی گرتوەتەوە، بەڵام ئەوەی جێی تێبینی و رەخنەیە ئەویش نەبونی ئامادەکارییە، بۆ نمونە: زۆرێك لە ناوەڕۆکی پرۆگرامەکان زۆر و گرانن و کاتیش بۆ جێبەجێکردنی کەمە، چونکە دەبوو پێش ئەوەی بیر لە گۆڕانی پەیڕەوی خوێندن بکرایەتەوە بیر لە چارەسەرکردنی کەمی بینا و لایەنی هۆشیاریی مامۆستا و خێزانەکان بکرایەتەوە. زۆرێك لە مامۆستایان بە پەروەردەی نوێی جیهانی ئاشنا نین و وەزارەتی پەروەردەیش لەو رووە ئامادەکاری پێویستی نەکردووە، ئەم سیستەمە نوێیەش بووەتە مایەی گاڵتەجاڕیی لایان. لە کوردستاندا گەورەترین کێشەی پەروەردە کەمی بینا و شێوازەکەیەتی کە بە کەڵکی وتنەوەی ئەو پرۆگرامانە نایەن کە ئێستا دەخوێنرێت و ئاستی پەروەردەیی خێزانیش لە کوردستان زۆر لاوازە و خێزانەکان زۆر گرنگی بە

منداڵەکانیان نادەن و تا ئێستایش ئەقڵیەتی "گۆشتەکەی بۆ مامۆستا و ئێسقانەکەی بۆ خێزان" پیادە دەکرێت .

گەورەترین گرفتی گۆڕانکاری پرۆگرامەکان لە کوردستان ئەوەیە کە راپرسی پێش وەخت ناکرێت و باری پەروەردەی وڵات لە بەرچاو ناگیرێت، کاتێك کە بیر لە هەر نوێکارییەك دەکرێتەوە بەتایبەت مەسەلەیەکی هەستیاری وەك (پرۆگرام)، ئەو لیژنانەی کە بۆ گۆڕینی پرۆگرامەکان دانراون، پێموانیە لایەنی دەروونی و تەمەنی قوتابی کوردستانیان بەگشتی لە بەرچاو گرتبێت یان هەڵەی زمان و رێزمانی کوردی زۆر هەیە کە چاك نەکراوە، ئەمانەش دەبنە مایەی رقلێبوونی قوتابی لە قوتابخانە و مامۆستایش هیلاك و بێزار دەکات کە بە بڕوای ئێمە وەزارەتی پەروەردە لەم هەنگاوەدا ئەگەر تاقی کردنەوەی پێ بکەی لە ١٠٠ چەند دێنێ کە بێگومان لە نیوە کەمترە!

تەنها ئەمانەی کە باسی دەکەم بەسە بۆ ئەوەی کە بیر لە چاکسازی لە پرۆگرامەکاندا بکرێتەوە کە لە دەمی مامۆستا و قوتابیانەوە بیستومە. قوتابیەکی پۆلی سێی بنەڕەتی هاواری لە دەست قورسی جانتاکەیەتی بەهۆی گەورەیی قەبارەو زۆریی ژمارەی پەرتوکەکان. بەخێوکەرێك دەیوت هێندە پرۆگرامەکان گرانە نازانم چی بە منداڵەکەم بڵێم بە تایبەت بابەتی زانست و بیرکاری و"سەن رایس=ئینگلیزیی". بەڕێوەبەرێك دەیوت





"خەریکە شێت دەبم کەس وانەی زاستی پۆلەی حەوت تا نۆ ناڵێتەوە و دەڵێن لێی تێ ناگەین و خولی چاك و تۆکمەشمان بۆ نەکراوەتەوە". مامۆستیایەکی "ئەلف بێ" ئاواتە خوازە ئەلف و بێکەی مامۆستا "ئیبراهیم باڵدار" بگەڕێتەوە چونکە "ئەلف بێی ئێستا لاوازە و تیایدا کار لەسەر چیرۆك نەکراوە". مامۆستایەکی کۆمەڵایەتی رای وایە کە "پرۆگرامەکان گیانی نەتەوەیی لای قوتابی نەهێشتوە". مامۆستایەکی زمانی ئینگلیزی دەیوت "سەن رایس زۆر چاك و گونجاوە بەس خۆزگە کاتی زیاتر و گرنگی دانی زیاتر بەم وانەیە دەدرا"، مامۆستایەکی زمانی عەرەبی بە گلەییە لەوەی کە زۆرتر گرنگیی بە زمانی ئینگلیزی دەدرێت و وانەکەی ئەو پشت گوێ خراوە و دواجار مامۆستایەکی زمانی کوردی وتی "خۆزگە ئێمەیش وەك وانەکانی تر کتێبی مامۆستامان دەبوو بۆ ئەوەی بمزانیە ئەو وشە بادینانە مانای چیە و لە خۆمەوە واتام بۆ دانەدەنا".

## پەروەردە و فێربوون، گرفت و گۆڕان

لە پێشوازی ساڵی نوێی خوێندندا جارێکی تر چەندین گرفتی هەنوکەیی یەخەی پەروەردە و فێربوون دەگرێت کە ئەم گرفتانە باکگراوەندی هەیە و ساڵ لە دوای ساڵ کێشەکە بەرەو هەڵکشان دەچێت و لایەنی پەیوەندیداریش پلانێکی درێژخایان و تۆکمەی بۆ چارەسەرکردنی نیە .

وەك لای هەموان ئاشکرایە لە دوو ساڵی رابردوودا وەزارەتی پەروەردە لە ژێر ناوی سیستەمی نوێی پەروەردە چەند گۆڕانێکی کردووە کە لە ماوەی دوو ساڵی رابردوودا ئەو گۆڕانە جێگیر بوونی بە خۆیەوە نەبینیوە و گۆڕانکاریی لەرزۆکن، بۆ نمونە: لە گۆڕان لە پرۆگرامدا پار پرۆگرامێك دەخوێندرا ئەمساڵ پرۆگرامێکی تر کە بە راستی لای قوتابیان وەرگرتنی بە گران دەکەوێتەوە و مامۆستایش توشی گرفت دەکات چونکە دانانی پلان بۆ پرۆگرامەکان هەموو ساڵێك بە شێوازێکە. ئەو گۆڕانانەی کە دەکرێت پێشتر تەجروبەی بۆ ناکرێت واتا چەند قوتابخانەیەك بخرێتە خزمەتی ئەو ئەزمونەوە نەك هەموو پرۆسەکە، ئەمە لە کاتێکدا لە رووی مادییەوە داهاتێکی زۆری





گشتی بە فیڕۆ دەدات و جارێکی دیکەپەروەردە لە ژێر ناوی گۆڕانکاریدا بەرەو دواوە دەچێت .

لە ئەمساڵی خوێندنی ٢٠٠٨-٢٠٠٩ دا گرفتەکانی بواری پەروەردە و فێربوون بە شێوەیەکی گشتی وەك خۆی ماوەتەوە و بگرە لە هەندێك روو دا گرفتە پەروەردەییەکان روو لە زیاد بوونن کە دەکرێت ئێمە باس لە گرفتە گشتگیر و سەرەکیەکان بکەین کە لە سەرتاسەری کوردستاندا پێم وابێ گرفتەکان یەکن. سەرەکیترین گرفتی ئەمساڵی بواری خوێندن، کەمی بینایە بەجۆرێك پار لە ئەمساڵ باشتر بووە و هەر کلاسێکی خوێندن لە هەر کوێیەکی کوردستان بگرین لە شار و ناحیەکاندا لە نێوان ٥٠ – ٦٠ قوتابی تێیدا دەخوێنن کە ئەمەیش وا دەکات مامۆستا لە قۆناغی بنەڕەتیدا هەر فریای ئەوە بکەوێت کە بە خوێندکار بڵێ:"بێ دەنگ بە و کوڕم وا مەکە و تۆ دانیشەوە تۆ بێ دەنگ بە"! لە پۆلێکی وا قەرەباڵەغدا کە دەچیتە ژوورەوە لە رووی ژینگەیەوە هەست بە ئاسوودەیی ناکەیت و لە هاویندا ئەو پۆلە گەرم دادێ بە تایبەت لە ئامادەییەکاندا .

گرفتێکی تر لە ئەمساڵدا زۆری و کەمی مامۆستایە لە بواری پەروەردە و فێروون. زۆریی مامۆستا مەبەستم زۆریی مامۆستایە لە هەندێك لە قوتابخانەکاندا، بۆ نمونە: رەنگە لە قوتابخانەیەکدا چەندین مامۆستای یەك پسپۆڕیی هەبن یان بوونی دوو

ماماۆستایی کە ئەمەیش خۆی بۆ خۆی جگە لە چارەسەری زۆری ماماۆستا بە بڕوای زۆرێك لە ماماۆستایان سودی نیە و ئەمساڵ ماماۆستایەکی زۆر تر دەبن بە هۆی چۆڵ بوونی گوندەکانی کوردستان کە ئەمەیش وشکە ساڵی وایکرد کە ئەو گوندانە قوتابخانەکان دەرگاکانیان دابخرێت  یان کەمی ماماۆستا و نەبوونی هەندێك پسپۆڕیسی وەك بابەتە زانستیەکان و زمانەکان بە جۆرێك ماماۆستای غەیرە پسپۆڕ ئەو وانانە پڕ دەکەنەوە کە جارێکی تر قوتابی وا لێ دەکات کە ماماۆستای تایبەت بگرێت بۆ ئەوەی وانەکان بە باشی ئەزبەر بکات .

لە هەناوی سیستەمی نوێی پەروەردەدا گۆڕان بوو لە پرۆگرامەکان کە بە داخەوە دوو زاراوەیی بە جۆرێك لە جۆرەکان گرانی لای قوتابی دروست کرد. لە ساڵی پاردا و لە ئەمساڵدا دیتمان پرۆگرامەکان گۆڕان، ئەمەیش مایەی سەرئێشەیە بۆ ماماۆستایان و قوتابیان و دوو دڵیی لای هەردوو لا دروست کرد بە تایبەت بۆ قوتابیانی پۆلە کۆتاییەکان .

نەمانی تاقیکردنەوەکان و گۆڕانی خێرا لەو رووەوە بە تایبەت نەکەوتن لە پۆلی یەکەم و دووەم و سێیەمی بنەڕەتی، چونکە قوتابی لەم قۆناغەدا زۆر گرنگی بە فێربوون نادات و وا دەکات کە لە پۆلی چوارەمدا ماماۆستا توشی سەرئێشە بکات و لە هەمان کاتدا قوتابی توشی گرفت بکات و قوتابخانەی لا بتۆرێنیٚ یان





خێرا گۆڕان لە سیستەمی تاقی کردنەوەکان و وەك دەنگۆی ئەوەیە هەیە لە ئەمساڵدا تاقی کردنەوەی بەکەلۆریی لە نۆیەمی بنەڕەتی نەمێنیٚ .

وەك ساڵانی تر ئەمساڵیش وانە گرنگەکانی هونەر و وەرزش و کۆمپیوتەر فەرامۆش کراون و گرنگیی زۆری پیٚ نەدراوە، ئەمەیش بە هۆی زۆری قوتابی و کەمی بینا و سیٚ دەوامییەوەیە لە بینای قوتابخانەکاندا. وانەی کۆمپیوتەر ئەمساڵیش وەك خەیاڵ بۆ قوتابی باس دەکرێت و قوتابی وەك بابەتە کۆمەڵایەتیەکان لەبەری دەکات بە تایبەت لە قۆناغی ئامادەیی .

سەر باری کەموکورتییەکان، بەڵام ئاسۆکانی دەرچوون لە قەیرانی پەروەردە لە کوردستان دا لە چاوەڕوانی دەرچوندان لەو کێشانە. ئەو گرفتانە وای لە هاوڵاتیانی کوردستان کردووە کە پشت لە زانست و فێربوون نەکەن و هەموو دایك و باوکێك لە خەمی فێربوونی نەوەکەیدایە و هەندێك لە خەمخۆرانی بواری پەروەردە لە هەوڵدان بۆ نەمانی گرفتەکان لە سەرووی هەموویانەوە وەزارەتی پەروەردە لە سەرێتی خەمی جدی ئەو گرفتانە بخوات بە ئومێدی ئەوەی خەمەکان ساڵی دادیٚ کەم ببێتەوە و هەوڵی نەمانی بدرێت .

## نەوەیەکی نەخوێندەوار بەڕێوەیە

لە سایەی گۆڕانکاریی لە سیستەمی پەروەردە لە کوردستان و هێنانی سیستەمێکی نویٚ و جیهانی بە ناوی خوێندنی سویدی و نەهێشتنی شێوازی خوێندنی کۆن لە کوردستان، لە ئێستادا ئەگەری دروست بوونی نەوەیەکی نەخوێندەوار لە قۆناغی خوێندنی بنەڕەتی لەئارادایە. دە ساڵی تر بە تەواوەتی ئەو نەوەیە پیٚ دەگات.

بە شێوەیەکی گشتیی هەوڵدان بۆ گۆڕانکاری و هێنانی سیستەم و پرۆژەی زانستی لە کوردستان تەنها لە فۆرمدا بیری لیٚ دەکرێتەوە بەتایبەت کارکردن بۆ گۆڕانکاری لە سێکتەری پەروەردە و فێربوون چونکە (رۆسۆ) وتەنی "پەروەردە چەند گرنگە هێندەیش ئاڵۆزە". بە داخەوە لە هێنانی سیستەمی نوێی خوێندن لە کوردستان ناوەڕۆك و زەمینە هیچ لە بەرچاو نەگیراوە بە شێوەیەك کارکردن بۆ گۆڕانکاری لە پەروەردەدا لە کوردستان تەنها خۆی لە بڕیار و رێنمایدا دەبینێتەوە و کاری جدیی بۆ نەکراوە، بە شێوەیەك لەگەڵ هاتنی هەر بەرپرسێکی پەروەدەیی





و دانانی هەر وەزیرێکی پەروەردە، کار کردن و پرۆژەی پێشووی خۆی بە هەند وەر ناگرێت و دەست بە گۆڕانکاری دەکات و سیتەمی هەرەمی لە خۆراوە بۆ سەرەوە پیادە ناکات.

تەنها بە بەراوردێك دەتوانین بزانین خوێندن لە رابردوودا باش بووە یان ئێستا. لە سایەی سیستەمی نوێی جیهانی و دەکرێت ئەوەمان لە بیر بێت من باسی واقیع دەکەم نەك باشیی سیستەمی سویدی وەك پرۆژەیەکی جیهانی. لە رابردوودا خوێندن بە گشتی بەم شێوەیە بووە: لە پۆلێکدا بیست تا سیی خوێندکار دەیخوێند، بینای قوتابخانەکان باخچە و سەوزایی تێدا بوو لەگەڵ گۆڕەپان بۆ وەرزش و هۆڵی هونەری. مامۆستایان رۆشنبیریی گشتییان بۆ ئەو سەردەمەی خۆیان لە ئاستێکی باشدا بوو، بەخێوکەری منالٚ چاودێری رۆڵەکانی دەکرد و لێپرسرینەوە هەبوو لەسەر شێوازی لێدان و چاو سور کردنەوە بە مەبەستی فێربوون. رێز لە نێوان مامۆستایان و سەرپەرشتیاراندا هەبوو و قوتابی بە چاوی رێزەوە سەیری مامۆستای دەکرد و لە قوتابخانەکاندا ئاستی زانستی بە گشتی لە زۆر رووە باش بوو . بەلاٚم لە ئێستادا و پاش هێنانی سیستەمی سویدی لە پۆلێکدا چل بۆ پەنجا خوێندکار دەخوێنن لە کاتێکدا بە پێی پرۆژەی فێربوونی سویدی دەبێت پۆلێك لە نێوان پانزە بۆ بیست قوتابیدا بێت و وتنەوەی وانە بە شێوازی

گروپ بێت. بە دەگمەن باخچە و سەوزایی بە گشتی لە قوتابخانەکاندا هەیە و سەرەڕای گۆڕانکارییکردن لە هەندێك لە قوتابخانەکاندا، بەڵام وانەی وەرزش و چالاکی وەرزشی پشت گوێخراوە بە شێوەیەك وانەی وەرزش لە خشتەی وانەکاندا خراوەتە وانەی کۆتاییەوە یان بۆ پڕ کردنەوەی خشتەی وانەکانە، وانەی هونەریش هیچی لە وەرزش کەمتر نیە بۆ گرنگی پێدان و لە زۆرێك لە قوتابخانەکاندا دەدرێتە ئەو مامۆستایانەی کە وانەیان کەمە یان بەڕێوەبەر بە دڵی نیە یان بۆ ئاسانکاریی دەیداتە هەندێك مامۆستا. ئاستی رۆشنبیری مامۆستایان لاوازە، بە شێوەیەك کە گرنگی بە پسپۆڕیی نادرێت، مامۆستای کۆمەڵایەتی زانست دەڵێتەوە، یان مامۆستای دیبلۆم وانە بە قوتابی پۆلی حەوت و هەشت و نۆ دەڵێتەوە، مامۆستایایەکی بابەتە کۆمەڵایەتیەکان بۆی گێڕامەوە کە بابەتی زانستی پۆلی نۆیان پیّ داوە لە کاتێکدا لە کۆندا هەریەکە لە مامۆستایانی زانستی ( کیمیا و فیزیا و زیندەوەرزانی) ئەو وانەیان دەوتەوە. وانەی کۆمپیوتەر وەك زانستێکی سەردەم کە دەخوێنرێت تەنها بە ناو وانەیە، چونکە هەفتەی یەك وانە لە خشتەدا هەیە و بە تیۆریی دەخوێنرێت و مامۆستای پسپۆڕیش وانەکە ناڵێتەوە .

لە ئێستادا ئاستی پەروەردەیی خێزانەکان زۆر لاوازە و بە کەمی خێزانەکان گرنگی بە منالّەکانیان دەدەن و چاودێری رۆڵەکانیان





دەکەن. بەڕێوەبەری خوێندنگەیەك بۆی باس کردم لە قوتابخانەکەیان بە هۆی بڕیاری نوێی پەروەردە لە پۆلی یەك تا سێی بنەڕەتی کە وا بلاّوە کە کەوتن نیە نزیکەی سەد قوتابی پێویستی بەوە دەکرد کە باوکی سەردانی قوتابخانە بکات بۆ دەرچون یان مانەوە لەو پۆلەدا، بەڵام تەنها بەخێوکەری سیّ قوتابی بۆ ئەو مەبەستە سەردانی کردوون و تەنها یەکێکێکیان وتویەتی منداڵەکەی دەر نەچێنن و ئەوانی تر فێر نەبوونی منداڵەکانیان بە لاوە گرنگ نەبووە! لە ئێستادا کە لێدان نەماوە بە دیلی لێدان نیە، ئەمەیش فەوزای دروست کردووە، چونکە وەك وتمان سیستەمی خوێندن تەنها بە بڕیار و رێنمایی گۆڕاوە و پۆلەکان جمەیان لە قوتابی دێت و بیناکان کۆنن و مامۆستایانیش شارەزا نین بە زانستی دەروونناسی نویّ بە شێوەیەك ئاڵۆزییەك لە سیستەمەکەدا هەیە و هاوکات پەیوەندی مامۆستا و سەرپەرشتیارانیش حاڵی باش نیە و پەیوەندیەکە ئەگەر بشێت وای ناو ببەین، خۆی لە پەیوەندی تۆم و جێریدا دەبینێتەوە! سەرپەرشتیاری بەڕێز دێتە قوتابخانەوە ئیتر مامۆستایان دەم وچاو بە یەکدا دەدەن و بەردەوام شەڕیانە لەسەر رێنمایی و بڕیارەکان . کۆتا خالّ کە دێینە سەری، ئاستی زانستیی قوتابییە بۆ فێربوون و دەرچوون کە لاوازە، ئەمەیش بە هۆی ئەو بڕیارەی کە کەوتنی نەهێشتەوە لە قوناغە گرنگەکانی

خوێندن لە بنەڕەتیدا بە شێوەیەك هەندێك مامۆستا پۆلی چوار بە یەکی بنەڕەتی دادەنێن، ئەمەیش گرفت بۆ قوتابی و مامۆستا دروست دەکات. گۆڕانی خێرای پەرتوکەکانیش لەولاوە بوەستێت بە تەنها زانستی پۆلی چواری بنەڕەتی لە ساڵی ٢٠٠٧ ەوە تا ئێستا چوار جار گۆڕاوە، من پێم سەیرە حکومەتی هەرێم و پەرلەمان ئەو هەموو پارە کە وەزارەتی پەروەردە بە فێڕی دەدات بۆ نایەتە دەنگ، چونکە دواجار پارەی لە چاپ دانی ئەو کتێبانە ماڵ و سامانی گشتیی نییە؟!.بە بڕوای من هەموو ئەمانە وا دەکەن کە دواجار نەوەیەکی نەخوێندەوەر پێبگات بە شێوەیەك منداڵی ئێستا لە چاو منداڵی جاراندا زۆر وریا و هار و هاجە، بەڵام نەخوێندەوارە بە مانای وشەو بێ ئاگایە لە خوێندن، ئەمەیش لە داهاتوودا وڵات تووشی کارەسات دەکات و نەوەیەکی نا هۆشیار و بێ ئینتیما پێ دەگەیەنین، بەڵام تۆ بڵێی ئەمەیان سیاسەتێك نەبێت پیادە بکرێت بۆ ئەوەی خوێندنی حوکمیی یان خۆڕاسی بەو شێوەیەی لێ بکرێت و کار بکرێت بۆ گرنگی دان بە قوتابخانەی ئەهلی و خوێندن بە پارە؟!





### ئەنفال و هەڵەبجە لە پرۆگرامەکانی خوێندن دا

سێکتەری پەروەردە و فێربوون دەرگای ئاشناکردنی مرۆڤە بە زانست و زانیاریی و پەروەردەکردنی لەسەر بەها باڵاکان بە ئاراستەکردنی دروستکردنی نەوەیەکی بە ئاگا و بەرپرسیار بە کۆمەڵگە، بەو پێیەی پەروەردە و فێربوون کاریگەری راستەوخۆیان لە ژیانی تاك هەیە بە تایبەت لە قۆناغێکی هەستیاری وەك منداڵی و گەنجی پێویستە هەموو خۆشی و نەهامەتیەکانی نەتەوە لەپاڵ زانست و پەروەردەدا رەنگ بداتەوە .

ئەنفال وەك یەکێك لە نەهامەتیەکانی نەتەوەی کورد و ناسنامەی ئازارەکان و ناساندنی ئەم نەتەوەیە بە دنیا، دەبێت لە بواری پەروەردە و فێربووندا بە تایبەت پرۆگرامەکان چۆن جێگەی بکرێتەوە؟ بەو پێیەی پرۆگرامەکانی خوێندن خاڵی بەیەك گەیشتنی مامۆستا و قوتابین دەبێت بە پێی بەرنامە و قۆناغ و تەمەنی منداڵ کارەساتێکی وەك ئەنفال بەگرنگییەوە خرابێتە روو، بۆ ئەوەی نەوەی ئەمڕۆی ئەنتەرنێت و سبەی کوردستان بەباشی ئاگایان لە رەهەندەکانی کارەساتەکان بێت .

ئەوەی من ئاگاداربم، روداوو و کارەساتەکان بەتایبەت هەڵەبجە و ئەنفال لە بابەتی زمان و بابەتە کۆمەڵایەتیەکاندا جێگەی دەبێتەوە. لە پرۆگرامەکانی زماندا بە کرچ و کاڵیی لە بابەتی

خوێندنەوە و زمان و ئەدەبی کوردیدا کارەساتی ئەنفال خراوەتەوە (تەنها لە پۆلی چوار ). لە پرۆگرامی بابەتە کۆمەڵایەتیەکانیش دا لەپۆلی نۆی بنەڕەتی و دوانزەی ئامادەیی باسی لێوە کراوە. بۆ کارەساتی هەڵەبجە لە بابەتی زمانی کوردیی پۆلەکانی شەش و هەشتی بنەڕەتی لە بەشی خوێندنەوەدا باسی لێوە کراوە و لە بابەتە کۆمەڵایەتیەکانی نۆی بنەڕەتی و دوانزەی ئامادەیی خراونەتە روو.

گەر لە ناوەڕۆکی هەریەکە لەو بابەتانە ورد ببیتەوە کە باس لە هەڵەبجە و ئەنفال دەکەن، بە راستی هەست ناکەی کارەساتێکن کە گەورەن و بونەتە ناسنامەی نەتەوەیەك. بۆنمونە: لە بابەتی ئەنفالی خوێندنەوەی کوردی پۆلی چوار دا، تەنها ناونیشانەکە نوسراوە ئەنفال، ئەگینا لە ناوەڕۆکدا بە وشەیەکیش باس لە ئەنفال ناکات و بەداخەوە بایەخ و گرنگی کارەساتەکە شێوێنراوە، بە جۆرێك ئەگەر دەیەکی تر ئەو پرۆگرامە بخوێنرێت و ئەو بابەتە بەو شێوەیە بخرێتە روو، نە مامۆستا و نە قوتابی لێی تێناگەن. لە بەشی مێژووی پرۆگرامی کۆمەڵایەتی پۆلی نۆی بنەڕەتی دا، زۆر بە کرچ و کاڵی باس لەو رووداوە مێژووییە کراوە، کە دەکرا چەند لایەنێکی بخرایەتە روو هەر لە بابەتەکانی ئەو کتێبەدا شتی وا زەق کراوەتەوە کە لە چاو ئەنفالدا هاوتا نیە، کەچی چەندین پەڕەی بۆ تەرخان کراوە و لە پرۆگرامی



پەروەردەو فێربوون، گرفت و گۆڕان

کۆمەڵایەتیی دوانزەی بنەڕەتی دا لە بەشی مێژوودا تا رادەیەك کاری باش لەسەر ئەنفال کراوە بە چەند لایەن و دەرهاویشتیەك. سەبارەت بە کارەساتی هەڵەبجە کە لە سەرەوە ئاماژەم بۆ کرد کە گرنگی چۆنە لە پرۆگرامەکاندا بە تایبەت لە زمانی کوردیدا کە لە بەشی خوێندنەوەدا دانراوە زیاتر باس لە شاری هەڵەبجە کراوە نەك کارەساتی کیمیاباران و زەرەر و زیان و کاریگەریەکانی. لە بەشی ئەدەب دا هیچ شیعر و پەخشانێك بۆ ئەنفال و هەڵەبجە تەرخان نەکراوە کە زیاتر قوتابی سوود لەو بەشە دەبینێت و گرنگی پێ دەدرێت لە لایەن مامۆستایانەوە .

لە هەریەکە لەو پرۆگرامانەی کە لەسەرەوە ئاماژەم پێدا، دەکرێت بە زنجیرە و لە بەشە گرنگەکاندا رووداو و کارەساتەکان بە تایبەت هەڵەبجە و ئەنفال جێگەیان بکرێتەوە و بە زنجیرە دابنرێن واتا: با لە بابەتی کۆمەڵایەتی پۆلی شەش و نۆ و دوانزە دا بە باشی بخوێنرێت، هەروەها لە زمانی کوردی دا لە بەشە گرنگەکانی وەك رێزمان و ئەدەب، گرنگییان پێ بدرێت بە پێی قۆناغ و زمانی منداڵ. دەکرێت لە بەشی رێزماندا جێگەی ئەو کارەساتانە بکرێتەوە و ئەو نمونانەی کە هێنراونەتەوە باس لەو کارەساتە بکەن .

ئەگەر ئەقڵیەتی دانانی پرۆگرام لە کوردستان بەو شێوەیە بێت کە شتی بێ بایەخ لە چاو کارەساتی ئەنفال و هەڵەبجەدا گەورە

بکرێتەوە و بەو شێوەیە کە باسم کرد گرنگی بەو کارەساتانە بدرێت پێم وانیە نەوەیەکی بە ئاگا سەبارەت بە رووداوەکانی خۆمان پەروەردە بکەین، چونکە بیرمان نەچێت نەوەی ئەمڕۆ نەوەی سەردەمی خێرایەکانی تەکنۆلۆژیا و تاکی قوتابی کاتی ئەوەی نیە لە دەرەوەی پرۆگرامەکان خۆی رۆشنبیر بکات بە داتا و زانیاری و رووداوەکان، مامۆستایانیش گوێی پێنادەن و بە سانایی ئەو کارەستانە بۆ قوتابی دەخەنە روو بە تایبەت بۆ سالآنی داهاتوو.





## وانەکان بۆ پڕ کردنەوەی کارت

لە ئەمڕۆی سەردەمەی تەکنۆلۆژیا و دنیای پێشکەوتندا، پێویستە سیستەمی پەروەردە و فێربوون گۆڕانی بەسەردا بێت و سەردەمیانە مامەڵە لەگەڵ پێشکەوتنەکانی ئەو بوارەدا بکرێت، سەرەڕای پەیڕەو کردنی سیستەمی نوێی پەروەردە لە کوردستاندا کە بەدەر نیە لە سەدان کەموکورتی، پێمخۆشە لەم وتارەدا تیشك بخەمە سەر لایەنێکی بچووکی دانانی نمرەی قوتابی و پڕ کردنەوەی کارت .لای هەموان ئاشکرایە ئەمساڵ گۆڕان لە شێوازی تاقیکردنەوەکان کرا، کە تاقیکردنەوەی وەرزیی بوو. بە بڕوای من لێرە بەدواوە وەزارەتی پەروەردە کار لەسەر ئەوە دەکات کە کاریگەریی نمرە نەهێلێت، بەڵام جارێکی تر و دوای ئەنجامدانی تاقیکردنەوەکان، نمرە بووە بە پێوەر بۆ هەڵسەنگاندنی قوتابی و کارت هاتە ناوەوە. پڕ کردنەوەی کارت و پێدانی نمرە بە قوتابی هەمان مەهزەلەی ساڵانی رابردووی تێدا دووبارە بووەوە، چونکە دانانی نمرەی وانەکانی (هونەر،

وەرزش، سروود، وێنە و پەروەردەی مەدەنیی) لە سەر میزاجی مامۆستا دانرا نەك ئەوەی کە لایەنی هەڵسەنگاندنی تێدا لەبەرچاو بگیرێت. بۆ نمونە: لەپۆلەکانی (یەك و دوو و سیٚ)ی بنەڕەتیی، رەنگە دانانی نمرە بۆ وانەکانی تر گرفتی هەبێت و مامۆستا نمرەی قوتابی داناوە بە بیٚ ئاگای و نمرە بۆ قوتابی دانراوە کە قوتابییەکە وازی هێناوە و مامۆستا ئاگای لیٚ نەبووە و ئەو قوتابیە پلەی زۆرباشی وەر گرتووە!مامۆستایەك بۆی باس کردم کە مامۆستای وەرزش، (٩٠) نمرەی داوەتە قوتابییەك لە کاتێکدا ئەو قوتابیە خاوەن پێداویستی تایبەتە (کەمئەندامە)! یان نمرەی بابەتی پەروەردەی مەدەنی بە گۆترە دانراوە و قوتابی ئەو وانەیەی هەر نەخوێندووە و ئاگای لە ناوەڕۆکەکەی نەبووە یان پەروەردەی هونەر و سروود تەنها کاتی پیٚ پڕکراوەتەوە و لە کارت دا نمرەی بە ئارەزوو بۆ دانراوە .

بە راستی ئەمەی خستمەروو، یەکێکە لەگرفتەکەکانی پەروەردە کە حەقی خۆیەتی وەزارەتی پەروەردە خەمی جدی بۆ بخوات و ئەو وانانە بۆ پڕکردنەوەی خشتەی وانەکان و کارت نەبێت، مامۆستای ئازیز و خەمخۆران و وەزارەتی پەروەردە با چیتر ئەو وانانە نەبنە جیگەی گاڵتەی قوتابی و بێزاری مامۆستا. دەتوانرێت ئەو وانانە بکرێنە سەرەکی لە خشتەکاندا و پرۆگرامی بۆ دابنرێت، چونکە دانانی ئەم وانانە لە خۆڕا نیە و لە





رووی دەرونیی و پەروەردەییەوە خزمەتی زۆر بە قوتابیان دەگەیەنێت و خاڵی بەهێز دروست دەکەن لە نێوان وانەکاندا و قوتابی بە قوتابخانەوە پەیوەست دەکەن. بیهێنە پێش چاوی خۆت کە ئەم وانانە چەند کاریگەرن لە یەکێك لە خوێندنگەکاندا قوتابیەك پێی ناخۆشبوو پشوو بێت بە هۆی ئەوەی کە ئەو رۆژەی کە پشوو بوو وانەی وەرزشیان لە خشتەدا هەبوو . بە ئەوە کۆتایی پیٚ دێنم کە ئەرکی مامۆستا تەنها فێربوون نیە کە فێریشی ناکات! بەڵکو پەروەردەکردنیشە، کە باشترین رێگە بۆ پەروەردەکردن گرنگی دانانە بەو وانە پەروەردەییانە.

### ئەزموون و تاقیکردنەوەی بابەتە کۆمەڵایەتییەکان

تاقیکردنەوە لە سێکتەری پەروەردەدا زۆر گرنگی پێدراوە و لە سایکۆلۆژیای پەروەردەدا بە گرنگ دەبینرێت، بەو شێوە پێناسە کراوە: "بۆ زانینی ئاستی تێگەیشتنی قوتابی پێویستە هەڵسەنگاندن بکرێت بە شێوەیەك رادەی ئاستەکان بزانرێت". بە بێ ئەزموون و تاقیکردنەوە زانینی ئاستەکان لە پۆلێکدا مەحاڵە، ئەمەیش وا دەکات کە داتا و زانیارییەکان کۆبکرێتەوە و لە رێگەی ئەزموونەکانەوە خاڵە بەهێز و لاوازەکانی فێرخواز دەستنیشان دەکرێت .

لە خوێندن دا لە وڵاتی سوید، هەموو بابەتێك ملکەچ دەکرێت بۆ تاقیکردنەوەی بەردەوام ( زارەکی، نووسراو) و لە خوێندن لە کوردستانیشدا تاقیکردنەوەی بابەتە کۆمەڵایەتییەکان بە هەردوو تاقیکردنەوەدا دەڕوات و لە کۆرسێکی خوێندندا حەفتا ٧٠ نمرە لەسەر تاقیکردنەوەی نووسین و سی ٣٠ نمرە لەسەر تاقیکردەوەی زارەکیە.



پەروەردەو فێربوون، گرفت و گۆڕان

گرنگترین تاقی کردنەوەکان لە بواری پەروەردە و فێربووندا

١ – تاقیکردنەوەی گوتاریی

٢ – تاقیکردنەوەی وەڵام کورت

٣ – تاقیکردنەوەی بابەتی

٤– تاقیکردنەوەی زارەکی

* <u>تاقیکردنەوەی گوتاریی :</u> ئەو جۆرە تاقی کردنەوەیە کە پێویستی بە وەڵامی درێژ هەیە و لەم شێوەدا فێرخواز پشت بە زانیاریی و شارەزایی خۆی دەبەستێت. ئەم تاقیکردنەوەیە بە وشەکانی ( باسی بکە، رونیبکەرەوە، بەراوردی بکە ..... ) دەستپێدەکات .

نمونەی پرسیاری تاقیکردنەوەی گوتاریی: پ/ ئاوهەوای هەرێمی کوردستان لە وەرزی زستان و هاویندا چۆنە؟ روونی بکەرەوە .

<u>خاڵە بەهێزەکانی تاقیکردنەوەی گوتاریی:</u>

١ – ئەگەری قۆپی و فێڵکردنی قوتابی کەمترە .

٢ – رێگە بە قوتابی دەدات بە سەربەستی بۆچونەکانی خۆی بخاتە روو و زانیاریەکان رێك بخات.

٣ – جیاوازیکردن لە نێوان قوتابی بەهرەمەندی خاوەن بیر و ئەو قوتابییەی کە بابەت لەبەر دەکات .

خاڵە لاوازەکانی تاقیکردنەوەی گوتاریی:

١ – دانانی نمرەی ئەم جۆرە پرسیارانە پشت بە میزاجی مامۆستا دەبەستێت.

٢ – جواننوسی و رەوانبێژی و رازاندنەوەی وەڵامەکان کاریگەری لەسەر دەروونی مامۆستا دەبێت بۆ دانانی نمرە.

٣ – ناتوانرێت پرسیاری زۆر بهێنرێتەوەو ناوەڕۆکی هەموو بابەتەکان بخرێتە روو، زۆر جار خوێندکار بە هۆی ئەوەی ئەو بابەتەی کە کراوەتە پرسیار نەیخوێندووە توشی گرفت دەبێت .

* تاقیکردنەوەی وەڵام کورت: ئەم تاقیکردنەوەیە دەکەوێتە نێوان پرسیاری تاقیکردنەوەی گوتاریی و بابەتیەوە و پێویستی بە وەڵامی کورت هەیە. وەڵامەکان یان وشەیەك یان مێژوویەك یان ناوی کەسایەتیەکە، ئەمیش دوو جۆرە:

ا – شێوازی پرسیار، نمونە:

پ / پایتەختی عێراق چ شارێکە؟

ب – شێوازی تەواوکردن، نمونە:

پ / بە شاری ........ دەوترێت دەروازەی راپەڕین .





* تاقیکردنەوەی بابەتیی: خەسڵەتی سەرەکی ئەمجۆرە پرسیارانە ئەوەیە کە بۆ هەر بڕگە و پرسیارێك چەند وەڵامێك هەیە، لە کاتی دانانی نمرە بۆ وەڵامی ئەم پرسیارانە میزاجی مامۆستا رۆڵ نابینێت بۆیە پێیدەوترێت پرسیاری تاقیکردنەوەی بابەتی.

ا – پرسیارەکانی راست و هەڵە، نمونە:

پ / هەولێر پایتەختی هەرێمی کوردستانە.

ڕاستە هەڵەیە

ب – پرسیارەکانی جووتکردن (بەیەکگەیشتن)، نمونە:

١–عەلی کوڕی ئەبی تالیب سەرکردەی مادەکان

٢ – هارونە رەشید خەلیفەی راشدیە

٣ – دیاکۆ خەلیفەی عەباسیە

ج – پرسیاری هەڵبژاردن، نمونە:

پ / بریتییە لە پارچەیەك زەوی کە سنورێکی دیاریکراوی هەیە و لە دێر زەمانەوە رۆڵەکانی گەلی لەسەر دەژی؟

ا – گەل ، ب – سەروەری ، ج – نیشتیمان ، د – حکومەت

<u>خاڵە بە هێزەکانی تاقیکردنەوەی بابەتیی:</u>

١ – میزاجی مامۆستا لە دانانی نمرەدا رۆڵ نابینێت و فێرخواز مافی خۆی وەردەگرێت.

٢ – وەڵامەکان روون و ئاشکرا دەبن و رێگە بە قوتابی نادرێت بە ئارەزووی خۆی شت بنوسێت.

٣ – دەتوانرێت لە رێگەی ئەم پرسیارانەوە هەڵسەنگاندن بۆ زۆربەی بابەتەکان بکرێت.

<u>خاڵە لاوازەکانی تاقیکردنەوەی بابەتی:</u> بۆ خاڵە لاوازەکانی ئەم جۆرە تاقیکردنەوەیە باشیەکانی تاقیکردنەوەی گوتاریی دەگونجێت بە پێچەوانەوە .

<u>* تاقیکردنەوەی زارەکی :</u> ئەو تاقیکردنەوەیە کە خوێندنەوە و نوسینی تێدا بەکار ناهێنرێت و قوتابی بە دەم وەڵامی پرسیارەکان دەداتەوە. زۆر جار لەمجۆرەدا ناتوانرێت هەڵسەنگاندنی تەواوەتی بۆ فێرخواز بکرێت، چونکە هەندێك پرسیار سووك و هەندێکی تر قورس دەبن .





**ساردی پۆلەکان و سیستەمی سویدی**

هەموو رۆژێك کە دەچیتە پۆلەکانی خوێندن، لەگەڵ نوسینی یەکەم وانە لەسەر تەختە رەشەکە، دەستەکانت گۆ ناکەن هێندە ساردە، وەزارەتی پەروەردەی خەمخۆریش دەیەوێ سیستەمی سویدی لە کوردستان جێبەجێ بکات! مامۆستا بەو تەمەنە زۆرەی و بەو هەموو بەرگریەی لاشەیەوە، هێندە سەرمایەتی ئاخۆ قوتابی و مناڵی داماو چیی بکات لە سەر ئەو رەحلە رەق و تەق و ساردە؟!

ساردی پۆلەکانی خوێندن وا دەکات کە خوێندکار هەر بیری لای ئەو رچین و تەزێنە بێت کە لە بەیانی زوودا کە دەچیتە ژوورەوە ئەو مێشکە سپی و جوانەی دەرچێت و مێشکی جام دەبێت، ئیتر مامۆستایش دەستدەکات بە وانە وتنەوە و "دەی هەستە بزانم چی دەزانی؟" کاکی قوتابی لە سەرما هیچی بیر نەماوە و مامۆستای دڵسۆزیش بە دار و زللە دێتە سەر و گوێی و هێندەی

تر توشی سەرما دەبێت، ئەم کەش و ژینگە وا دەکات کە بە درێژایی دەوام قوتابی بەستەزمان ئاگای لە پۆل و خوێندن نەبێت.

وەزارەتی پەروەردە دەیەوێت کەشی سویدبخولقێنێ لە رووی سەرماوە بۆ ئەوەی خوێندکار و قوتابی کورد وا بزانێ لە سوید دایە و دواتر بە پرۆگرام و مەنهەجی دوو لەهجەوە دەست دەکات بەجێبەجێکردنی ئەو پلانە سویدیە لە پۆلێکی پڕ لە خۆڵ و سارد و بە مامۆستای فول مەعلومات و پڕ لە زەوقەوە، ساردی پۆلەکان وا دەکات کە مامۆستای پڕ لە عیلم و مەعریفە زۆر گەرم و گوڕانە زانست ببەخشێتە قوتابیان .

وەزراتی پەروەردەی سوید ببورە کوردستان!! تکایە زوو فریامان بکەون و لەو سەرمایەی سوید رزگارمان بکەن، چونکە ئەگەر کار وا بڕوات ئەو سیستەمە توشی گرفت دەبێت و رەنگە ساردی هۆڵەکانی خوێندن گەرم بکاتەوە و کارێکی وا بکات کە هەریەکە لە مامۆستا و قوتابی نەتوانن سود لەو گۆڕانەی وەزارت وەر بگرن!

بڕوا بکەن زۆر ئیحراج و شەرمەزار بووم ئەو کاتەی کە لە پۆلی یەکەکان وانەی پەروەدەی ئیسلامیم دەوتەوە و قوتابیەکی ژیکەڵە پرسی:"مامۆستا زۆر ساردە، ئەوە بۆ سۆپەکەی ئیدارە ناهێنن بۆ ئێمە؟" بەراستی ئەو قوتابیە کە ئەو پرسیارەی کرد





من زۆر شەرمە زار بووم کاتێك کە دەمەوێ ویژدانی خۆم مورتاح بکەم و زانستی فێر بکەم، لە کاتێکدا ئەو سەرمایەتی! باشە دەکرێ من و مامۆستاکانی وەك من چۆن وەلاٚمی ئەو قوتابیە بدەینەوە؟ بەڕاستی من وەلاٚمی ئەو پرسیارە بۆ جەبابی وەزیر و وەزارتی پەروەردە بەجێدەهێڵم و پێی دەڵێم کاکی وەزیر تکات لێ دەکەم زوو فریای پۆلە سارد و سڕەکان بکەوە تاوەکو هەرچی خوێندکارە وازی لە خوێندن نەهێناوە یان هەمویان توشی نەخۆشی نەبوون. تکایە وەزارەتی پەروەردە پۆلەکان گەرم بکەرەوە و فریا بکەوە و نەوت و سۆپا بگەیەنە قوتابخانەکان بە تایبەت قوتابخانەی شوێنە زۆر ساردەکان!

## مندالأنی کورد لە ٦/١ دا

بەپێی دەقی ڕێکەوتننامەی مافەکانی مندالأن لە یەکەم ڕۆژی لە دایکبوونەوە تا تەمەنی ١٨ساڵی بە قۆناغی منداڵیەتی دادەنرێت کە ئەمەیش بە کۆمەڵێك قۆناغدا تێدەپەڕێت کە ژیانی دوا ڕۆژی تاك دیاری دەکات. منداڵ بە پێی لێدانەوەی سایکۆلۆژی و زانستی بایەلۆژی گەر لەم تەمەنەدا چەند لایەنێکی ژیانی بۆ فەراهەم نەکرێ ئەوا ناتوانێ لە داهاتودا تاکێکی تەندروستی لێ دەربچێت، واتا منداڵ بە هەموو پێو دانگێك دەبێت وەك منداڵ بژی کە لە ڕێکەوتننامەی مافەکانی مندالأندا ئەم لایەنە بە زەقی دیارە و باسکراوە .

منداڵی عێراق و کوردیش وەك هەموو مندالأنی جیهان لە ساڵی ١٩٨٩ ئەو کاتەی کە ڕێکەوتننامەی مافەکانی مندالأن مۆر دەکرێ حکومەتی عێراقی ئەو کاتیش دەبێتە یەکێك لەو وڵاتانە





کە پابەند دەبێت بە هەر ٥٤ بەندەکەی ئەو ڕێکەوتننامەیەوە کە سەراپا باس لە منداڵ و مافەکانی دەکات. لێرەدا ئەگەر ئاوڕێك لە مێژووی ئەو دەمەی عێراق و کوردستان بدەینەوە دەبینین چەندین منداڵ بە بێ تاوان پێشتر و لەو کاتەو ئێستاشی لەگەڵ بێت کە چۆن مافەکانی پێشێل دەکرێت و دەبنە قوربانی ململانێ سیاسی و نەتەوەییەکان و ئەو کاتەیش باس لە منداڵ دەکرێت کە وڵاتان لە جەژن و بۆنەکاندا منداڵ بۆ مەرامەکانیان باس دەکەن.

لێرەدا پێمخۆشە لەم وتارەدا باس لە ئێستای ژیانی مندالأنی کورد بکەم لە چەند گۆشە نیگایەکەوە کە لە ژیانی ئایندەیاندا ڕەنگدانەوەی ڕاستەوخۆی دەبێت. مندالأنی کورد لە ئێستادا بە جۆرێك لە جۆرەکان لە چاو ڕابردوودا باشترن بە مانا سیاسی و گوزەرانیەکەی، بەڵام ئایا لە ئێستادا ئەو ڕووداوانە دووبارە نابنەوە کە بەراستی ژیانی ئێستای هەر منداڵێك بگری بۆ خۆی مایەی ئەوەیە لەسەری بوەستی.

منداڵی کورد بە تایبەت ئەو دەڤەرو شار وشارۆچکانەی کە کەنار و دووره  دەستن، زۆر لەحاڵێکی خراپ دایە و ژیان لەوێ بەزەحمەت دەگوزەرێ و ڕۆژ نیە لە بازاڕ دا هاواری منداڵێك لە سەر عەرەبانەیەکی حەماڵی یان بەقاڵی ویژانمان نەهەژێنێ و بەو دیمەنانە منداڵی خۆمانمان بیر نەکەوێتەوە، چونکە ئێستا و

ئەوسای منداڵی ئەو جێگەیانە وەك یەكە، بەڵام رەنگە مێژووەكە بیگۆڕێ، بوونی توندوتیژیی لە نێو بازاڕ و كوچەو كۆڵانەكاندا یەكێكی ترە لەو خەمانەی كە زۆرێك لە منداڵانی پێوە گیرۆدەیە لە كاتێكدا ئێمە بە خۆمان دەڵێین دیموكراسی! كێشەیەكی تری ئەمڕۆی منداڵی كورد بێبەش بوونیەتی لە سەرەتایترین ماف كە ئەویش خوێندن و فێربوونە كە بەداخەوە منداڵانی لادێ لەم مافە قوربانیی پلە یەكن .

لە ئێستادا لە كوردستاندا چەندین رێكخراوی منداڵان هەیە كە خۆیان بە داكۆكیكار لە ماف وئەركی منداڵان دەزانن بەڵام ئەو رێكخراوانە ئیش و كارەكانیان زیاتر لە سەنتەرەكاندا كۆكردوەتەوە، بەدەگمەن چالاكیی و بوونی بەردەوامی ئەو رێكخراوانە لە دەرەوی سەنتەردا دەبینین، نمونەیش بۆ ئەوە جێگەیەكی وەك گەرمیان بە تایبەت ناحیەی رزگارییە كە منداڵانی ئەو جێگایانە زۆر بە كەمی دەزانن كە ٦/١ چیە و كار و چالاكیان بۆ كراوە و ئیش هەبووە، بەڵام بەقەد زۆریی و خەمەكانی منداڵان لەو ناحییە نیە .

گرفتێكی تری منداڵی كورد لە ئێستادا دەست درێژی كردنە سەر منداڵان بە تایبەت دەست درێژی سێكسیە و زیندوترین وێنەیەش بۆ ئەو حاڵە ئەوەیە كە لە گەرمیان چەند پیاوێك مێردمنداڵێك دەبەن بۆ كاری سێكسی و دوای ئەوەی ئەو منداڵە





رازی نابێ بە داواكەیان بەر گوللەی دەدەن و دوای بریندار بوونی بە سەختی گیان لە دەست دەدات. هەر لەم دۆسیەدا دەبینین و دەبیستین كە رۆژانە لە جێگە و شوێنە نهێنیەكاندا چۆن توندوتیژی و دەست درێژی دەكرێتە سەر منداڵان .

گرفت و خەمەكانی منداڵان زۆرن، بەڵام من لە دوا گرفتدا باس لە نەبونی پلانی حكومەت و رێكخراوەكان دەكەم كە كاری جدی بۆ منداڵان ناكەن و زۆرێك لە منداڵانی گەرمیان و هەڵەبجە و بادینان خەون بە شاری یاری و سەنتەر و رێكخراوەكانی منداڵانەوە دەبینن، خەمەكان زۆرن بەڵام لە ٦/١ دا من دەخوازم كە حكومەت و رێكخراوە NGO كان هەوڵ بدەن بۆ بەدیهێنانی مافەكانی منداڵان بە بێ جیاوازیی و گەڕانەوەی منداڵ بۆ ژینگە و دنیا بێ گەردەكەیان.

## کۆنگرەی یەکێتی مامۆستایان

### تەنها چارەسەری گرفتی بینای قوتابخانەکانی پێ دەکرێت؟

هەڵبژاردن وەک یەکێک لە مافە سەرەتاییەکانی تاک بۆ بە دەستهێنانی ئاوات و ئامانجەکان، زۆرێک لە چین و توێژەکان پیادەی دەکەن و بە پێی هەلومەرجی مێژوویی، شێوازەکانی هەڵبژاردن گۆڕانی بەسەردا هاتووە. یەکێک لە هەڵبژاردنەکانی توێژێکی گرنگی کۆمەڵگە کە مامۆستایە حەق وایە هەڵوێستەی جیدی لەسەر بکرێت، چونکە هەڵبژاردنی یەکێتی مامۆستایان وەک ڕێکخراوێکی پیشەیی لە کوردستاندا زۆرترین کاردانەوەی دەبێت بۆ چین و توێژەکانی تری کۆمەڵ.

بەرەو کۆنگرەی دوانزەی یەکێتی مامۆستایان کە تەمەنی نزیکەی نیو سەدەیە و توانیویەتی مێژوویەک بۆ خۆی تۆمار بکات لە ئێستادا پاشەکشە لەپیادە کردنی ئەو مافە دیموکراسیەی کە هەڵبژاردنە بەدی دەکرێت بە هۆی ئەوەی هەموو ئەو کەسانەی کە بەشداری لەم هەڵبژاردنە دەکەن، ئەگەر ڕۆشنبیر نەبن خۆ خوێندەوەران، مەبەست لەم قسەیەم بۆ ئەوەیەکە پاش نیو سەدە خۆ ڕێکخستن و خەباتی قەڵەم تازە بە



پەروەردەو فێربوون، گرفت و گۆڕان

تازە هەڵبژاردنی یەکێتی مامۆستایان بە لیستی داخراوە، لە کاتێکدا ئەم مۆدێلە لە هەڵبژاردنە گشتی و تەنانەت عەشرەتگەریی و عەشایەرییەکانی کوردستانیشدا مۆدێلی نەماوە. بۆ نمونە: عەشیرەتێک کە سەرۆکەکەی دەمرێت و هەڵبژاردنی بۆ دەکرێت بە ڕێگە عورفی و عەشایەرییەکەی، ئەندامانی عەشیرەت دەزانن دەنگ بە کێ دەدەن و کێ نوێنەریانە، بەڵام بە داخەوە یەکێتی مامۆستایان وەک ڕێکخراوێکی پیشەیی و خاوەنی خەبات و مێژوو، تازە بە تازە دەنگ بۆ لیستی داخراو دەدات، ئەمەیش وا دەکات کە هەندێک لە کەسانی نەشیاو و نەزان بە کاری ڕێکخراوەیی ببنە ئەندامی کۆنگرە و ئەو ڕێکخراوە.

بەبڕوای من یەکێک لە کارکردن و دەستکەوتی لیستەبەشداربووەکان خۆی لەم خاڵەدا دەبینیەوە کە دەنگدان بە لیستی کراوە بوایە نەک ئەوەی ئێستا دەیبینین هەر لیستە و چەند پەرەگرافێکی ئینشائیی نوسیوەو دەیەوێت کاری لەسەر بکات. خاڵێکی تر کە مایەی هەڵویستە لەسەر کردنە، ئەویش ئەوەیە کە ١٠٠ مامۆستا بەبێ هەڵبژاردن ڕاستەوخۆ دەبنە ئەندامی کۆنگرە ئەمەیش وا دەکات کە کارکردن بۆ گۆڕین و سەر لەنوێ داڕشتنەوەی هەیکەلی کارکردنی ئەو ڕێکخراوە قورس و زەحمەت بێت یان بە شێوەیەکی تر بوونی سەد ئەندامی ستافی پێشوو دەبنە پارێزەری کارە باش و خراپەکانی ئەو ڕێکخراوە و

زەحمەت دەبێت ئەندامانی نوێ بتوانن گۆڕانی ریشەیی بکەن، بۆیە من پێشنیار دەکەم ئەم ئەندامانە مافی دەنگدانیان نەبێت بۆ خاڵە گرنگ و جەوهەرییەکان و بۆ ئەندامانی نوێ بەجێبهێڵدرێت.

هەبوونی ئەو هەموو درووشمە بریقەدار و زۆرەی لیستەکانی هەڵبژاردن دەیسەلمێنێت کە ئەم رێکخراوە لە قەیراندایە و دۆخی مامۆستایان و پەروەردە و فێربوونیش خراپە و پێویستی بە کارکردنی جیدی هەیە، ئەمەیش تەنها بەوە دێتەدی کە ئەم رێکخراوە لە داهاتوودا فرەرەنگ و فرەدەنگ بێت نەك لە دەستی یەك لایەندا کۆت بکرێت. بوونی نزیکەی ١١٥ هەزار ئەندام لەم رێکخراوە و مافی دەنگدانیان، ئەرکی قورس دەخاتە ئەستۆی ئەو لیستانەی کە سەر دەکەون چونکە هەر یەکە لەو لیستانە چەندین دروشم و پرۆژەیان خستوەتە روو لە واقیعی حاڵیشدا دۆخی مادیی و مەعنەویی مامۆستا و سێکتەری پەروەردە لە کوردستان خراپە وەك گرفتە زۆرەکان کە هەیە، کە سەرەکیی ترینیان دەرکردنی دۆخی پەروەردەیە لەو قەیرانانەی کە لە سایەی "سیستەمی سویدی" تێیکەوتوە و هەوڵدان بۆ کەم کردنەوەی گرفتەکان، چونکە وەك وەزیری پەروەردە خۆی رایگەیاندبوو کە بودجەی چوار ساڵی هەموو کوردستان بۆ پەروەردە تەرخان بکرێت ئەوسا دەتوانرێت ئاریشەکان بەرەو کۆتا بچن. ئەوەشی پەیوەندی بە مامۆستاوە هەیە بە بڕوای من





سەرەکیترین کێشە گەڕانەوەی کەسایەتیە بۆ مامۆستا هەم لە روی ماددی و هەم لە رووی مەعنەوەییەوە .

هەموو چین و توێژەکان چاویان لە هەڵبژاردنی مامۆستایانە بۆ پێدانی وێنەیەکی جوان بە رووی دیموکراسی و هەموو مامۆستایانیش بە ئومێدن لیستەکان بە تایبەت براوەکان درۆیان لەگەڵ نەکەن و گرفتەکان چارە بکەن نەك تەنها دروشم بێت وەك دەبینین کە کەناڵە جۆر بە جۆرەکانی راگەیاندنی لیستەکان بوەتە بازاڕی سەرەنج راکێشانی مامۆستایان و هەموویان خەمیان بووەتە خەمی پەروەردە و فێربوون، وەك مامۆستایەك دەیوت: خۆزگە راگەیاندنی حزب و لیستەکان هەموو کات ئەوەندە خەمخۆربونایە نەك بۆ تەنها کاتی هەڵبژاردن بەڵکو راستگۆیانە بەردەوام خەمیان هەبوایە، چونکە پەروەردە خەمی هەموانە و هەموانیش منالی ماڵی قوتابخانە و مامۆستاین.

بە هیوای هەڵبژاردنێکی شەفاف و پاك و کارکردن بۆ چینی مامۆستا و تەکانێك بۆ چارەسەری گرفتەکان، زۆر نا تەنها بینای قوتابخانەکان چاك و زۆر بن بۆ ئەوەی قوتابی و مامۆستا لە سایەی پۆلێکی ئارامدا ئاشت ببنەوە! من وەك مامۆستایەك داواکارم لە کۆنگرە و ستافی نوێی یەکێتی مامۆستایان تەنها گرفتی بینای قوتابخانەکان چارەسەر بکەن، وەعدتان دووە تەنها بەس ئەمە هیچی تر نا؟!

## پەروەردە و فێربوون
## لە كارنامەی لیستە كوردستانیەكانی هەڵبژاردنەكەی ٧ / ٣ دا

سێكتەری پەروەردە و فێربوون وەك كایەیەكی گرنگی ژیان لە ئەمڕۆدا كاریگەری راستەوخۆی لەسەر تاكەكانی كۆمەڵگە هەیە بە ئاراستەی پێگەیاندنیان و بەدیهێنانی ئامانجە گشتیەكان، لە ئێستادا پەروەردە و فێربوون لەسەر ئاستی جیهانی گرنگی زۆری پێ دەدرێت و یەكێكە لە كەرتە ئاڵوز و بایەخدارەكان.

لە ئەمڕۆدا هەڵبژاردن وەك یەكێك لە بنەماكانی دیموكراسیی كاریگەری لەسەر زۆر كایەی تر هەیە بە تایبەت پەروەردە و فێربوون بە شێوازێك رەنگە كەسی دەنگدەر گرنگی بە كارنامە و درووشمەكانی لایەنە سیاسیەكان لەم رووە بدات، لای هەموان ئاشكرایە حزب و لایەنە كوردیەكان بۆ هەڵبژاردنی ٧ / ٣ / ٢٠١٠ خۆیان ئامادەكردووە و كارنامە و دروشمی تایبەت بە





خۆیان هەیە و لە كارنامەكانیاندا گرنگیان بە زۆر بوار داوە لە نێویشیاندا پەروەردە و فێربوون.

سێكتەری پەروەردە وەك بەشێكی گرنگی ئەمڕۆی ژیانی مەدەنی تاك، وەك مافێك لەلایەن هەر چوار لیستی كوردستان بۆ هەڵبژاردنی ٣/٧ ەوە بووەتە جێی بایەخیان بەجۆرێك هەر چوار لیستەكە بە چەند خاڵێك تیشكیان خستووەتە سەری، لە كارنامەی هیچ كام لە لیستەكاندا پەروەردە و فێربوون گرنگی یەكەم و بنەڕەتی نەبووە، بەو پێیەی لە بەشە كۆتاییەكاندا باسیان كردووە.

لە لیستی كوردستانیدا پەروەردە و فێربوون لە بەشی خزمەتگوزاریدا لە مەرتەبەی سێیەمدایە و بە سێ خاڵ كار لەسەر ئەم بوارە دەكەن، كە خاڵی یەكەمی بریتییە لە "پەرەپێدانی بواری پەروەردە و خوێندن لە رێی بە دیموكراسی كردنی سیستەمی پەروەردە و پەیوەندی نێوان بەڕێوەبەرێتی و دەستەی مامۆستایان و قوتابیاندا .... ). لیستی یەكگرتوو لە مەرتەبەی شانزەهەمدا بە حەوت خاڵ كار بۆ سێكتەری پەروەردە دەكات بەم شێوەیە:"سیستەمێكی پەروەردەیی پاشان فێركاری بۆ بەدەستهێنانی پسپۆڕیی و لێهاتتە پێویستەكانی پرۆسەی گەشەپێدان .... ". لیستی گۆڕان لە كارنامەی سیاسی خۆیدا لە تەوەرەی چوارەمدا پەروەردە و فێربوونی تێكەڵ كردووە بە چەند

بوارێکی تر بە جۆرێك لە خاڵی پێنجەمدا بەم شێوەیە کار دەکات: "پەرەپێدانی زانکۆ و دامەزراوە ئەکادیمیەکان و ناوەندەکانی دیراسات و لێکۆڵینەوە بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی زانستی یان قەدەغە کردنی دەستوەردانی حزب لە کاروباریان و زامنکردنی سەربەخۆییان و دابینکردنی بودجەی تەواو بۆیان "و هەروەها لە تەوەرەی سێیەم و لە خاڵی سێدا هاتووە " دانانی پلانی ستراتیجی بۆ چاککردنەوەی و نۆژەن کردنەوەی کەرتەکانی تەندروستی و پەروەردە و فێربوون ". دواجاریش کارکردنی لیستی کۆمەڵیش بۆ ئەم کەرتە، زۆر بە کورتی لە دوو خاڵدا باس کراوە کە بریتین لە:" خاڵی شانزە": کار کردن بۆ چاکسازیکردن لە پرۆگرامەکانی خوێندن لە سەرتاسەری عێراقدا بە جۆرێك کە ببێتە مایەی پێگەیاندنی نەوەیەکی شارەزا و پابەند بە رەوشت و بەها بەرزەکان " و لە"خاڵی بیست و سێ دا: دابین کردنی خزمەتگوزاریە تەندروستی و فێرکاریەکان بە خۆڕایی بۆ هاوڵاتیان ".

کاتێك من وەك دەنگدەر و هاوڵاتیەك گوزەر بەسەر کارنامەی ئەو لیستانەدا دەکەم و دەگاتە سێکتەری پەروەردە و فێربوون چەند بۆچوون و تێبینیەکەم لا دروست دەبێت کە رەنگە هەر هاوڵاتیەك بە تایبەت کەسێك لە بوارەکەدا کار بکات هەمان بۆچونی لا دروست ببێت، کە ئەو کارنامانە دەخوێنیتەوە هەستدەکەی ئەو





خاڵانە تەنها یەك تاکە کەس نوسیویەتی و رۆتیناتی پێوە دیارە، بەجۆرێك زیاتر لە داڕشتنێك دەچێت کە قوتابیەك بۆ مامۆستاکەی بینوسێت، چونکە دەمی هەر کەس بکەیتەوە ئەو قسە سادە و ساکار و بێ کردارانە دەزانێت، هەروەها بایەخ نەدانی بنەڕەتی و گرنگ بەم بوارە دەری دەخات کە ئەو لیستانە پەروەردە و فێربوونیان بە لاوە گرنگ نیە بە جۆرێك کە هیچ کام لە چوار لیستە کوردیەکە بە جەوهەریی و قوڵیی نەچونەتە ناو بابەتەکەوە، تەنانەت هەر دوو لیستی (کۆمەڵ ، گۆڕان) زۆر بە کورتی تیشکیان خستوەتە سەر بوارەکە بە شێوەیەك منی دەنگدەر بە زەحمەت تێڕوانینی ئەوان لەمەڕ پەروەردە و فێربوون تێدەگەم.

خاڵێکی تر کە گرنگە، ئەوەیە پەروەردە و فێربوون لە کوردستان لە قەیراندایە،چونکە هیچ کام لە لیستەکان باسی بەرەو پێش چونی خاڵی ئیجابی پەروەردەیان نەکردووە لە کوردستان بە لیستی دەسەڵات (هاوپەیمانی کوردستانی)یشەوە کە نۆزدە ساڵە لەو بوارەدا کار دەکات و چەندین نەوەی پێگەیاندووە و بەردەوامیش بە جۆرێك لە جۆرەکان پشتیوانییان لە باشبوونی کردووە و لەو بوارەیشدا هەوڵی باش هەبووە .

بە بڕوای من دەبوو لیستەکان کارکردن و خاڵی گرنگی هەوڵەکانیان ئەم بوارە بوایە، چونکە تێکچوونی زۆربەی

بوارەکانی ژیان لە کوردستان بۆ خەلەل لە پەروەردە و فێربوون دەگەڕێتەوە کە دواجار نەوەیەکی ناهۆشیار و دوور لە ئینیتیمای نەتەوە دروست دەبێت و بینینەکانی ئایندە بۆ هەموان رون نابێت، هەموان و خەمخۆرانی بواری پەروەردە و فێربوون لە کوردستان و عێراق دەزانن کە ئەم بوارە پێویستی بە هەوڵدان و ئاوڕلێدانەوەی زانستی و دوور لە بۆچونی تاکە کەسی هەیە کە ئەمەیش ئەرکی گرنگ و ئەولەویت دەبێت بۆ ئەو کاندید و لیستانەی کە متمانەی هاوڵاتیان بە دەست دێنن و دوای ٧ / ٣ دەچنە پەرلەمان بۆ ئەوەی لە ڕێگەی ئەوانەوە سیستەمێکی تەندروستی زانستیی پەروەردە فەراهەم بێت بۆ هەموو تاکێکی کوردستانی و عێراقی بە بێ جیاوازی لە هەر بوارێکدا بێت. چاوەڕوانی هیمەتی پەرلەمانتارانی سبەین بۆ چاکسازی و سەرلەنوێ بونیاد نانەوەی ئەم کەرتە هەستیار و ئاڵوزە، با بە هەموان دەست پێ بکەین بە تایبەت لیستی براوە، با نوێنەرەکانی گەل لە هۆڵەکاندا خەویان لێ نەکەوێت و هەر لە خۆوە دەست بەرز و سەر شۆڕ نەکەنەوە.





## کێ فێری کردن ماڵی مامۆستا بسوتێنن؟!

کولتوری سوتان وەك کاردانەوەیەك لە نێو هەموو کۆمەڵگایەکدا بوونی هەیە بە تایبەت لە کۆمەڵگە تازە پێگەیشتووەکان یان ئەو وڵاتانەی مافی تاکی تێدا پێشێلدەکرێت، لە کوردستاندا لە دوای ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٩١ ی خەڵکی کوردستان ئەم دیاردەیەپەرەی سەند وەك رقی تۆڵەسەندنەوە و بینیمان لە ڕاپەڕیندا چۆن هەموو دامو دەزگا حکومیەکان سوتێنرا تەنانەت دەزگا و فەرمانگە مەدەنیەکانی وەك ناسنامە و نەخۆشخانە و پەروەردە، گەشەکردنی کلتوری سوتان وەك تۆڵە کردنەوە لە ساڵانی رابردوودا بەرگێکی سیاسی بەردا کرا بە تایبەت لە خۆپیشاندانەکانی ساڵی ٢٠٠٧ دا لە کوردستان کە خەڵکی بۆ ئاو و کارەبا و سوتەمەنی دەهاتنە سەر جادە کەچی فەرمانگە مەدەنیەکانی وەك پەروەردەیان دەسوتاند، ئەمە بۆ؟!

ئایا لە کوردستان قوتابخانەکان و دامەزراوە پەروەردەییەکان ئامانجیان پەروەردەکردنی خەڵکە یان تەنها ئەوەیە کە منداڵ بخرێتە قوتابخانە و مامۆستا موچە وەربگرێت. لە کەلار لە خۆپیشاندانەکەی ٧ / ٩ دا بۆچی خەڵکی بە تایبەت گەنجان

ویستیان پەروەردەی گەرمیان بسوتێنن؟ بەراستی من دوو بۆچون لێرەدا دەخەمە روو: یەکێکیان ئەوەیە کە ژمارەیەك لە هاولاَتیان خاوەنی بڕوانامە نین یان بڕوانامەکانیان ساختەیە و دەیانەوێت بە سوتانی پەروەردە ئەو کارەیان بۆ بچێتە سەر ، ئەوی تریان ئەوەیە کە سیستەمی پەروەردە لە کوردستان خوێندکار و لاوی کوردی لەسەر رق و کینە پەروەردە کردووە و گیانی نیشتیمانیبوونی لا نەهێشتووە، تەنانەت گەنجی کورد قوتابخانە و پەروەردەی بەلاوە گرنگ نییە و پێی ئاساییە بچێت هەموو بڕوانامە و مەلەفی کەس و کاری بسوتێنێت، چونکە پەروەردە و فێربوون بۆ ئەو سوودی نەبووە و ئەو پێیوایە مادام دانامەزرێت چش لە هەموو شتێك.

تەنها لە ساڵی ٢٠٠٩ دا لە سنوری گەرمیان سێ حاڵەتی سوتانی ماڵی مامۆستا و قوتابخانە رویداوە، جگە لە سوکایەتیکردن بە مامۆستا و هەڕەشەکردن. لە رزگاریی ماڵی مامۆستایەکی ئامادەیی بەمۆ دەسوتێت و لە گوندی "دەورە"یش قوتابخانەی ئەو گوندە دەسوتێنرێت و دواجاریش ماڵی سەرپەرشتیاری پەروەردەیی (حەمید مەجید) دەسوتێنرێت، ئەمە جگە لە سوکایەتی بەردەوام بە مامۆستایان کە بە بڕوای من هۆکارەکانی پشت ئەم روداوانە زۆرن، کە رەنگە حەق و ناحەقی تێدا بێت، بەڵام سوتان بە مانای تۆڵەکردنەوە





یان ترسان بەڕاستی کارێکی زۆر قێزەونە بە تایبەت دژی کەسێك کە لە بواری پەروەردە و فێربووندا خزمەت دەکات .

ئایا سوتانی ماڵی مامۆستا و دامو دەزگای پەروەردەیی هەروا سانایە یان لە چییەوە سەرچاوەی گرتووە و کێ لێی بەرپرسە؟ر ئەمانە کۆمەڵێك پرسیارن حەقی ئەوەیە کە کاری جدی لەسەر بکرێت، بەشێوەیەك کە مامۆستا جگە لەپێدانی زانیاریی و پەروەردە، چییتری کردووە یان ئەوەیە کە مامۆستا ناحەقە و مافی قوتابیان دەخوات و کاری ئەو پەروەردەیی نەبووە بە تایبەت پیاوێکی وەك مامۆستا حەمید کە زۆرێك لە تەمەنی بۆ خزمەتی پەروەردەی سنورەکە بووە؟ پێویستە ئەو بەڕێزە لەمەودا بە هەڵسوکەوتی خۆیدا بچێتەوە بە شێوەیەك کە کاری هاوشێوەی مەترسیدار لەسەر ژیانی دووبارە نەبێتەوە، چونکە مامۆستای بێ چەك و بێوەی، دوژمنی هەیە و دوژمنەکانی رەنگە ئەو قوتابی و مامۆستا و دۆستانەی خۆی بن کە بێن ماڵی بسوتێنن، ئایا بەڕاستی مامۆستا مافی کەس دەخوات یان بۆچی ئێمە کە خزمەت دەکەین خەڵکی رقی لێمانە بە بڕوای ئێوە ئەو حاڵەتی سوتانانە دەستێك لە پشتێتی یان رقە یان ئەو خەڵکە حەقیانە و دەستیان خۆش بێت یان بشکێت ؟ .

بێدەنگیی مامۆستایان و یەکێتی مامۆستایان لەم مەسەلەیەدا بەڕاستی جێگەی ترس و نیگەرانیە هەرچەندە یەکێتی

مامۆستایان بە بەیاننامە ئیدانەی ئەم حاڵەتانەی کردووە، بەڵام ئەمە ناکاتە هەڵوێستی جیدی، چونکە کار وابڕوات سەرەی هەموو مامۆستایەك دێت و حاڵەتەکان دەبنە دیاردە و دواتر کێشە. رەنگە هەندێك مامۆستا ئەم حاڵەتانەی پێ خۆش بێت بەهەر هۆکارێك بێت، بەڵام من پێموایە لەم مەسەلەیەدا هەموان ماڵمان لە شوشەیە و رۆژێك هەر دێت بەردی تێ بگیرێت. پەروەردە و فێربوون لە کوردستان خەریکی چیە؟ کێ قوتابی پەروەردە کردووە لەسەر ئەوەی کە ماڵی مامۆستا بسوتێنێت و هانی بدات لەجیاتی ئەوەی کاری چاك بکات کەچی هەر باکی بە هیلاك بوونی نیە؟ ئایا مامۆستا بەراستی فێری کردوون کە "دارا دوو داری بینی" یان فێری کردن دوو دوو ماڵی مامۆستا بسوتێنن!

سیستەمی تازە و پەروەردەیی بێپلان لە کوردستان، بە بڕوای من یەکێکە لە هۆکارەکانی ئەوەی کە ماڵی مامۆستا بسوتێت، چونکە ئەوە سیستەمی نوێی بێپلانە نەوەیەکی نەخوێندەوار و دوور لە بنەما پەروەردەییەکان پێ دەگەیەنێت و هەر خودی وەزارەتی پەروەردەیشە بەرپرسە لەو فەوزایەی کە ئێستا لە کەرتی پەروەردەدا دروست بووە. هەریەکە لە لایەنەکانی پۆلیس و هێزەکانی دیکەی ناوخۆ بۆ لەمەودوا بەرپرسن لە دووبارە بوونەوەی حاڵەتی لەو شێوەیە، چونکە ئەوان پارێزەری گیانی



پەروەردەو فێربوون، گرفت و گۆڕان

هاوڵاتیانن کە مامۆستایش بەشێکە لە هاوڵاتی ئەم کۆمەڵگەیە، ئەگەر کاری لەو شێوەیە دووبارەبێتەوە مانای وایە پلانی ئەمنی ئەوان تۆکمە نیە و قوتابییەك دەتوانێت بە ئاسانی ماڵی مامۆستایەك بسوتێنێت و کار لە پلانی ئەمنی ئەوان بکات.پێویستە کەسو کار و منداڵی ئێمە بەو شێوە لە پیرۆزیی و کاری مامۆستا نەڕوانن بە شێوەیەك کار بگاتە ئەوەی ماڵەکەی ئاگر تێبەر بدەن، هەروەها مامۆستایش وا نەزانێت ئەو لەسەر حەقە و نابێت پەنجەی بۆ درێژ بکرێت، چونکە ناحەقییکردن هەر کەسێك بیکات و هەرچی و هەرچۆن بێت، هەر ناحەقییە. رەنگە مامۆستاش هەبێت حەقی هاوڵاتیان بخوات و چەندین جار بیستراوەو بینراوە کە مامۆستا بەرامبەر قوتابی ناحەقی کردووە و تەنانەت کار گەیشتوەتە ئەوەی ئەو قوتابیە لە قوتابخانە بێزار بێت یان سەرپەرشتیاریش زۆرجاران ناحەقی بەرامبەر مامۆستا و پیشەکەی کردووە و رقی بەرامبەری دروست کردووە. لە کۆتاییشدا گۆرانی شاعیر جوانی فەرمووە:

بەڵێ، دیارە، لەناو قەومی بەسیتا قەدری سنعەتکار
وەکو عەکسی قەمەر وایە لەناو حەوزێکی لیخندا
بەڵام تەختی روناه و تاجی حورمەت میللەتی هۆشیار
بە ئوستادێ ئەدا وەك تۆ لەناو شمشاڵی کون کوندا

## وەرزی خۆپیشاندان و ناڕەزایەتیی لە پەروەردەدا دەستیپێکرد

دەستپێکردنی ساڵی خوێندن لە کوردستان بە کەمو کورتی و ناڕەزایەتیی و خۆ ئامادەنەکردن دەستی پێکرد و لەسەرجەم شار و گوندەکاندا خوێندکاران و مامۆستایان بە ناڕەزایەتیی و کەمو کورتیەوە چونە بەردەم خوێندنگەکان، سەرەڕای هەوڵەکان بە ئاقاری چارەسەری گرفتەکان، بەلاّم کێشەکان بە هەڵپەسێردراوی ماوەتەوە و تا هەنوکەیش کێشەکان لە چاوەڕوانی چارەسەردان.

نەبونی پۆلەکان بۆ خوێندن و خۆ ئامادەنەکردن لەو رووەو نەبوونی مامۆستای پسپۆڕ بە تایبەت بۆ پۆلەکانی حەوت وهەشت و نۆ، کە ئەو کەلێنە بە مامۆستای دیبلۆم پڕ دەکرێتەوە، لە کاتێکدا بە نووسراوی فەرمیی، وەزارەتی پەروەردە داوا دەکات کە مامۆستای هەڵگری بڕوانامەی دیبلۆم بۆی نیە وانە بەو پۆلانە بداتەوە، بۆ نمونە: وانەی زانست-ی پۆلی هەشت کە لە هەر سێ وانەی کیمیا ، فیزیاو زیندە) ی سیستەمی کۆن پێکدێت، دراوەتە مامۆستای کۆمەلاّیەتی، ئایا سیستەمی تازە بەم شێوەیە جێبەجێبکرێت، کۆنەکە باشتر نیە؟!





مامۆستایان و قوتابیان دەپرسن کە لە چوار مانگی هاویندا وەزارەتی پەروەردە و بەرپرسانی بوارەکە چیان کردووە و بۆ لە کاتی دەوامی قوتابخانەکاندا هاتونەو ئەو فەوزایەیان ناوەتەوە بە جۆرێك پۆلەکانی حەوت و هەشت و نۆ نەخوێنن و لە هیچ کویّ جێیان نەبێتەوە، مامۆستایان بە دوودڵیی دەچنە پۆلەکانەوەو تا ئێستا بەشە وانەکان دیاریی نەکراوە و بەڕێوەبەرەکان بە ئارەزووی خۆیان مامۆستا بۆ وانەکان دادەنێن و زۆر کات گویّ بەپسپۆڕی نادرێت بە تایبەت بۆ مامۆستایانی بابەتە کۆمەلاّیەتیەکان.

تەنها لە گەرمیان، لە مانگی ( ٩، ١٠ ) ی ساڵی ٢٠١٠ چەندین ناڕەزایەتی و خۆپیشاندان هەبووە، بۆ نمونە: خوێندکارانی پۆلەکانی حەوت و هەشت و نۆ خۆپیشاندانیان کردووە و چەندین جار نیگەرانیان دەربڕیوە و خوێندکاری گوندەکان بە هۆی نەبوونی مامۆستاوە مانیان گرت، بەتایبەت قوتابیانی گوندی پووقە. مامۆستایانی قوتابخانەی بەمۆ لە رزگاریی مانیان گرت و ناڕازیی بوون بە هۆی سوتانی ماڵی مامۆستایەکیانەوە و لە گوندی دەورە-یش قوتابخانەی گوندەکە سوتێنرا. دەرچوانی پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی کفری بە مەبەستی دامەزراندن خۆپیشاندانیان کرد و لە گەرمیان خوێندکارانی خوێندنی گەورە بە هۆی نەبوونی بینا و زۆری قوتابیەوە ناڕەزایەتییان دەربڕی بە

تایبەت قوتابیانی قوتابخانەی چیا، گۆڕانکاری بەڕێوەبەری قوتابخانەکان بە بیانوی نەبونی بڕوانامەی بەکالۆریۆس و جیاوازییکردن لەو بڕیارە لە قوتابخانەیەکەوە بۆ قوتابخانەیەکی تر، نیگەرانیی لای بەڕێوەبەر و مامۆستایان دروست کردەوە، بە جۆرێك لە دانانی بەڕێوەبەرەکاندا باس لە بڕوانامەی دیبلۆم دەکرێت و بۆ وتنەوەی وانەکان دەیانکەنە بەکەلۆریۆس و زۆر جار سەرپەرشتیارەکان لەو رووەوە پاڵەپەستۆ لەسەر مامۆستا درووست دەکەن و دەیانترسێنن، بەوەی کە لەو رووەوە گوێڕایەڵ نەبن دەیانگوێزنەوە. خوێندکارانی پەیمانگای تەکنیکی ئێواران لە کەلار دەستیان دایە مانگرتن بە هۆی کەمو کورتی و وەرگرتنی ٢٠٠ هەزار دینار لێیان بۆ خوێندن. دواکەوتنی نەهاتنەوەی ناوی قوتابیان و خوێندکاران لە زانکۆ و پەیمانگاکان کە بووەتە مایەی پرسیار و نیگەرانی و ترس لەوەی کە وەر نەگیرێن.

هەموو ئەو کەمو کورتیانەو چەندانی تر کێ لێی بەرپرسە؟ ئایا سیستەمی سویدی لە کوردستان تا چەند سەرکەوتوو بووە؟ زەرەرمەندی یەکەم لەم کێشانە کێیە و کێ خەمی نەمانی زانست و پەروەردە دەخوات لە کوردستان؟ کوشتنی گیانی نەتەوەیی لە لای قوتابی و مامۆستایان بە هۆی نیگەرانیان لەو دۆخانە کێ خەمی دەخوات؟





## ساڵی نوێی خوێندن پیرۆز بێت

٩/١٥ ی ئەمساڵ زەنگێکی تری ساڵی نوێی خوێندن لێدرا و قوتابیان و مامۆستایان لە سەرتاسەری کوردستاندا روویان لە دەرگای قوتابخانەکان کرد، بۆ دەستپێکردنی ساڵێکی پڕ لە هیوای زانستیی، پڕ بە دڵ پیرۆزبایی لە هەموان دەکەم بە هیوای بە فیڕۆنەچونی تێکۆشانی قوتابیان و مامۆستایان لە بەدەست هێنانی ئاستێکی زانستی باشتر و چارەسەرکردنی گرفتە پەروەردەییەکان لە هەموو ناوچەکانی کوردستان.

کەرتی پەروەردە و فێربوون لە گەرمیان لەئەمساڵدا خۆی ئامادە کردووە و هەوڵ دراوە بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکان، بەڵام بەو پێیەی کە پرۆسەکە گەورە و ئاڵۆزە چەندین گرفت و کێشەی دێتەرێ. ئەگەر گوزەرێکی خێرا بکەین بە چەند ئامارێکدا لە بواری پەروەردە و فێربووندا، زانیاریمان لەو رووەوە زیاتر دەبێت و لەو پرۆسە ئاڵۆزە باشتر تێ دەگەین. بۆ نمونە: تەنها لە قوناغی بنەڕەتیدا لە سنوری بەڕێوەبەرایەتی گشتیی پەروەردەی گەرمیان، نزیکەی چل و حەوت هەزار قوتابی دەخوێنن کە

نزیکەی بیست و دوو هەزاری کچە و زۆربەیان لە سنوری کەلاردان. نزیکەی دوو هەزار قوتابی لە باخچەکانی ساوایاندا هەن ئەمە لە کاتێکدا لە زۆربەی جێگەکانی گەرمیان باخچەی ساوایان نیە. لە هەموو ئەمانە دڵ خۆشتر خوێندنی خێرا و گەورەیە، کە لەم خوێندنەدا دیسان نزیکەی دوو هەزار فێرخواز هەن کە هەشت سەدیان لە ژنان و کچان پێك دێن.

هەر بە پێی ئامارەکان لە سنوری بەڕێوەبەرایەتی گشتیی پەروەردەی گەرمیان، ٣٣١ بینای قوتابخانە هەیە کە زۆرترین بینا هی قوناغی بنەڕەتیە کە ٢٦٣ بینایە و زۆربەشیان لە کەلاردان و هەر بە پێی ئامارەکان سنورەکە پێویستی بە ٦٣ بیناکەی دیکە هەیە.لە کەرتی پەروەردەدا ٤٠٠٨ مامۆستا وانە بە قوتابیان دەڵێنەوە کە ٢٠٢٨ یان لە کچان و ژنان پێك دێن کە دیسان زۆربەیان لە کەلاردا وانە دەڵێنەوە .

ئەگەر بە وردی ئەو ئامارانە بخوێنینەوە، تێدەگەین کە ئەم کەرتە چەند فراوان و ئاڵۆزە، چونکە پێموابێت هیچ لایەنێکی دیکەی ژیان وەك پەروەردە قەرەباڵەغ نیە. ئەگەر بەراوردی ئەم ئامارانە لەگەڵ رابردوودا بکەین بە تایبەت بۆ پێش بەهاری ٩١ ئەوە پەروەردە و فێربوون زۆر بەرەوە پێشەوە چووە، بەڵام لە چاو ئەو کاتەدا گرقتی زیاتر بووە، بۆ نمونە: پێشتر زۆر گرنگیی بە مەکتەب نەدەدرا بە تایبەت بۆ کچان، بەڵام ئێستا وانیەو ئەوانەی





کە لە سنورەکە دەخوێنن، کچانن. یان من لە بیرم بێت زۆربەی ئەو مامۆستایانەی کە دەهاتنە کەلار، خەڵکی کەلار نەبوون، کەچی ئێستا رێژەکە پێچەوانەیە. یان خوێندنی خێرا زۆر بێ بایەخ بوو لای خەڵکی، کەچی ئێستا هاوڵاتیان بە تایبەت ژنان زۆر بە گرنگییەوە روو لە بنکەکانی خوێندن دەکەن. پێموابێت لەو ئامارانەدا تەنها لە بواری بینادا پێشتر گرفت نەبوو، ئەویش بە هۆی گرنگی نەدانی خەڵکی بەخوێندن، ئەوەتا ئەمساڵ سنورەکە پێویستی بە بینای زۆر هەیە بۆ ئەوەی پەروەردە بە تەندروست بەڕێوە بچێت.

سەرەڕای کارکردنی بەردەوام بە ئاراستەی چارەسەر کردنی گرفتەکان، بەڵام بەبۆچونی من بۆ ئەمساڵی خوێندن هەریەکە لە گرفتی کەمی بینا و کەمو کورتیەکانی سیستەمی نوێی خوێندن و لاوازی ئاستی هۆشیاری مامۆستایان و بڵاو بوونەوەی نەخۆشییە باوەکان بە تایبەت ئەنفلۆنزای بەراز و باڵندە ئەو گرفتانەن کە هەڕەشە لە کەرتی پەروەردە و فێربوون دەکەن و پێویستە خەمی جیدییان بۆ بخورێت، بە تایبەت ئەو دوو پەتایە چونکە لەگەڵ وەرزی سەرمادا زیاتر نەخۆشیەکان پەرەدەسێنن و رەنگە پرۆسەکە پەکبخەن. ئەمساڵیش سیستەمی نوێ هەر لە گرفتدا جێبەجێدەکرێت و تا هەنوکەیش بە گران لای مامۆستایان باس دەکرێت و ئاستی پەروەردەی خێزانیش لەو

رووەوە لاوازە، چونکە پار ساڵ بەڕێوەبەرێك بۆی گێڕامەوە کە لە کۆی نزیکەی سەد قوتابی پۆلی یەك کە دەبوو بە رەزامەندی دایك و باوکیان بچونایەتەیە پۆلی دووەمی بنەڕەتی، کەچی تەنها سێ بەخێوکەر بەدەم ئەو داوایەوە چون و ئەوانی تر بە درێژای ساڵەکە گرنگییان بە رۆڵەکانیان نەداوە کە بە راستی ئەمە مەهزەلەیە و تەنانەت مامۆستایانیش نیگەران دەکات.

بە ئومێدی ساڵێکی پڕ لە تێکۆشانی زانستی و پەروەردە کردنی نەوەیەکی هۆشیار و نیشتیمان پەروەر لە بواری پەروەردە و فێربوون لە کوردستان و گەرمیان، هەروەها چارەسەر کردنی گرفتەکان لە لایەن حکومەتی هەرێم و وەزارەتەوە و بایەخی زۆرتری مامۆستایان و خێزانەکان بە قوتابیان و خوێندکاران و بەرزکردنەوەی ئاستی زانستی قوتابیان خۆیان. دووبارە ساڵی خوێندنی ٢٠٠٩ – ٢٠١٠ لە هەموان پیرۆز بێت.





### ژینگەی پەروەردەی لەبار، نەوەیەکی تەندروست بەرهەم دەهێنێت

ژینگە بە هەموو ئەو هۆکارە سرووشتی و دەستکردانە دەوترێت کە کاریگەری لە ژیانی تاکدا هەیە لە تەمەنە جیاوازەکاندا. ژینگەی قوتابخانە بە یەکێك لە ژینگە گرنگەکان لە ژیانی هەر یەکێك لە ئێمە دادەنرێت کە رۆڵی کاریگەر و راستەوخۆی بۆ داهاتوو دەبێت.

ژینگەی قوتابخانە، بێگومان لەجۆری ژینگەی دەستکردە کە خۆی لە هەموو ئەو هۆکارانەدا دەبینێتەوە کە لە قوتابخانەیەکدا هەیە. بە بڕوای من هەر تاکێك کە دەخرێتە بەر خوێندن یەکەمین ساتەکانی ئەو خستنە بەر خوێندنەی بیر ناچێت ئەگەر باش بێت یان خراپ، خۆش بێت یان ناخۆش . ژینگەی قوتابخانە هەر لە بینا و کەرەستەوە بگرە تا مامۆستا و قوتابی و پرۆگرام، هەمووی کاریگەریی خۆی هەیە و ژینگەیەکی تەندروست لە قوتابخانەدا نەوەیەکی تەندروست و پەروەردەیەکی ئامانجدار بەرهەم دەهێنێت و پێچەوانەکەیشی راستە. ژینگەی دروست خۆی لە بینایەکی مۆدێرن کە هەموو کەرەستە گونجاوەکانی خوێندنی تێدا بێت، دەبینێتەوە، کە ئێستا لە پەروەردە و

فێربوونی وڵاتە پێشکەوتوەکاندا هەیە و ژینگەی قوتابخانەی ئێستا پێویستە لەگەڵ رابردوودا زۆر جیاواز بێت. لە کوردستاندا ژینگەی قوتابخانەکان دۆخیان خراپە، چونکە لە رووی تەندروستیی و دەرونیی و پەروەردەییەوە گونجاو نیە، ئەمەیش بە ئاشکرا لە لای قوتابیان و مامۆستایان و خەمخۆرانی ئەو بوارە باس دەکرێت .نەگونجاندنی ژینگەی پۆلەکان وادەکات کە هەریەکە لە کارەکتەری مامۆستا و قوتابی پەروەردە و فێربوونیان لە لا خۆشەویست نەبێت، ئەمەیش کاریگەری لەسەر ئاستی دەرچون دەکات لە قوتابخانەکاندا، بە جۆرێك کە ژینگە هۆکاری بە دەستهێنانی نمرەی باش و دروستکردنی نەوەی نەرمو نیان دەبێت ئەگەر گونجاو بوو، بەڵام ژینگەی ناپەروەردەیی قوتابی تێیدا بژی ئەوا نەوەیەکی توندوتیژ و فەوزەویی درووست دەکات و ئەمەیش بە ئاشکرا لە رابردووی پەروەردە و ئێستایدا بەدی دەکرێت.

هەریەکە لە مامۆستا و قوتابی راستەوخۆ دەستیان لە بەرەو پێشچوونی ژینگەی قوتابخانەدا هەیە، بەوەی کە ئەو ژینگەیەی لێی دەژین دەتوانین بیڕازێنینەوە و لە رووی پاکو خاوێنی و سەوزکردنەوە رۆڵیان بۆ گەشەکردنی هەبێت، چونکە هەریەکە لە لایەنی پاکو خاوێنی و سەوزکردنی رووبەری قوتابخانەکان رۆڵی باشیان دەبێت لە فەراهەمکردنی ژینگەیەکی پەروەردەیی کە بە





داخەوە لە ژینگەی هەندێك لە قوتابخانەکان بە هۆی گرنگینەدان بە پاك و خاوێنی و رێژەی کەمی سەوزایی لە بیابانێك دەچن کە بە زۆر تاك تێیدا گوزەر بکات .

لە ئێستا حکومەتی هەرێم هەڵمەتی نیشتمانی بۆ دروستکردنی قوتابخانەی مۆدێرنی دەستپێکردوە، بە ئومێدی ئەوەی کە ژینگەیەکی پەروەردەیی بۆ هەریەکە لە مامۆستا و قوتابی بەرهەم بهێنێت بۆ ئاشتکردنەوەی ئەو دوو کارەکتەرە لە سایەی سیستەمی نوێی پەروەردەیدا بە جۆرێك پەروەردە ئامانجە زانستیەکانی باشتر ئاراستە بکات.

## زانکۆکانی کوردستان و کارکردنیان بۆ جینۆسایدی گەلی کورد

زانکۆکانی کوردستان وەك دامەزراوەیەکی ئەکادیمی زانستی باوەڕ پێکراو کە ڕۆڵیان لە زۆر بواری ژیان هەیە، بۆ ئێستا و رابردوو و ئاینده دەتوانن لە بوارە گشتیەکاندا کاری جیدی بکەن چ بە بەستنی کۆڕ و کۆبوونەوە چ بە پێشکەش کردنی توێژینەوە و زیندووکردنەوەی بەڵگەنامەکان یان بەستنی کۆنفرانس، یەکێك لەو لایەنە گرنگانەی کە زانکۆکان دەتوانن کاری لەسەر بکەن و کاری لەسەر دەکەن بواری زانستە مرۆڤایەتیەکانە بە تایبەت لە زانستی مێژوو و دەروونناسیی و کۆمەڵناسی و ئابوریی ....هتد دا بۆ پێگەیاندنی کەسانی ئەکادیمی و پسۆڕ و گرنگیدان بە لایەنە جۆربەجۆرەکانی ژیان بە تایبەت دەستخستنی بەڵگەنامەکان کە ڕۆڵیان هەیە لە نەفەوتانی ڕووداوە جۆربەجۆر و بابەتەکانی ژیانی کۆمەڵگا.

ئەنفال یان فراوانتر با بڵێین جینۆساید کردنی گەلی کورد لە لایەنی ڕژێمی بەعسەوە، ئەرکی یەکەمی زانکۆکان بە تایبەت کۆلێژە مرۆڤایەتیەکانە کە توێژینەوەی جۆراو جۆر بکەن لەو ڕووە، بە تایبەت بە ئەکادیمیکردنی ڕووداوەکان و هەوڵدان بۆ





نەفەوتانیان وەك ئەنفال کە ناسنامەی مەزڵومیەتی گەلی کوردە. دەزگا ئەکادیمیەکان پێویستە کار بۆ نووسینەوەی ئەو سەروەتە نەتەوەییە بکەن بۆ ئەوەی بە زانستیانە و یاساییانە بتوانین لە ڕێگەی ئەو کارەساتانەوە داوای مافی ڕەوای گەلەکەمان بکەین کە خۆی لە مافی چارەی خۆنوسیندا دەبینێتەوە بە شێوەیەك کە گێڕانەوەی ڕووداو و داتا و زیان و زەرەرەکان بەشێوەیەك ڕێك بخرێت کە لێکۆڵینەوەیەکی زانستی ستاندارد وەربگرێت.

زانکۆکان و کەسانی ئەکادیمی کە مەبەستم مامۆستا بەڕێزەکانە،پێویستە هانی قوتابیان بدەن بۆ ئەوەی کارکردنیان لەسەر ئەنفال بێت و ئەمان ببنە سەرچاوەی سەرەکی لەو ڕووە نەك ڕێگر بن لەوەی کە بەهۆی نەبوونی سەرچاوە، ڕێگریی بکەن. حەقوایە کە دەزگا ئەکادیمیەکانی تری وەك دامەزراوە و ڕێکخراوەکان و وەزارەتی پەیوەندیدار هانی لێکۆڵەران بدەن بۆ ئەوەی ساڵانە توێژینەوەی نمونەیی لەو ڕووەوە پێشکەش بکەن و لەو بوارەدا هانیان بدەن، کە بەداخەوە ئەم شێوازی کارکردنە لە زانکۆ و دەرەوەی زانکۆ کەمە.من پێشنیار دەکەم لە زانکۆکاندا بە تایبەت لە زانکۆی گەرمیان و هەڵەبجە، بەشی تایبەت و گرنگی زیاتر بە جینۆسایدی کورد بدرێت، بۆ ئەوەی لە ڕێگەی ئەوان و خوێندکار و مامۆستاکانیانەوە ئەو کارەساتە بە ڕەهەندە جۆربەجۆرەکانیانەوە بە زانستی تر بکرێت، نەك

نەوەی ئێستا و ئاینده ئاشنای ئەم کارەساتە نەبن. بە داخەوە تا ئێستا لە زانکۆکاندا ئەنفال نەکراوەتە مەنهەج کە بەم ڕێگەیە زیاتر نەوەکان ئاشنای کارەساتەکە دەبن بە جۆراو جۆری لایەنەکانی بە تایبەت وەك وتم لە کۆلێژە مرۆڤایەتیەکاندا دەتوانرێت لەم رووەوە زیاتر کار بکرێت، بۆ نمونە: خوێندکار لە بەشی مێژوو زۆرێك لە رووداو و بەسەرهاتی گەلان بە شۆڕش و رابردوویان دەخوێنێت کەچی تا ئێستا وانەو پرۆگرامی تایبەت بە ئەنفال نیە، بە هیوام لە گۆڕانکاریی لە سیستەمی زانکۆکاندا بیری لێ بکرێتەوە و بکرێتە وانەیەکی سەرەکی لە کۆلێژە پەیوەندیدارەکاندا.





## خوێندکاران هەوێنی خۆپیشاندانەکانن

ساڵی ٢٠١١ بە ساڵی خۆپیشاندانەکان لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا دادەنرێت و ئەم ساڵە بە ساڵی کەوتنی دیکتاتۆرەکان و گەندەڵکاران لە مێژوودا ناو زەند دەکرێت ، هەر ئەم ساڵە بە ساڵی بەشداری قوتابیان و خوێندکاران لە خۆپیشاندانەکاندا دەدەنرێت و بە سەر مەشقی هەموو هەوڵە نوێیەکان دەژمێردرێن بە شێوەیەك گەنجی خوێندکار بڕیار لە ئایندەی وولاتەکەی دەدات و لە توانایدایە دیکتاتۆرەکان لەسەر عەرشی دەسڵات بهێنێتە لەرزە لە پێناو ژیانێکی نوێدا .

خوێندکاران چینێکی گرنگ و بەشێکی زۆری کۆمەڵ پێك دێنن و لەو پێناسەیە دەرچون کە جاران دەوترا ئەمان چینێکی نا بەرپرس و مشەخۆری کۆمەڵن و ئینتیمایان بۆ نیشتیمان و خاك نیە بەڵکو ئێستا ئەوان شەقام دەجوڵێنن و داینەمۆی شۆڕشێکی بێ چەکن دژی ناعەدالەتی و گەندەڵی ، خوێندکاران ئێستا ئەو تاکە گوێ رایەڵە نین کە لە پۆلەکاندا بە دیار تەختە رەش و رەحلەکانەوە خەو بیانباتەوە بەڵکو ئێستا ئەوان ئەو تاکە بە ئاگایەن کە دەسەڵات لێیان دەترسێت و بەردەوام تفەنگەکان لە

کەمیندان بۆ سینگ و مێشکیان دژی زۆرداری و هەڵهاتنی خۆری یەکسانی .

لە کوردستان ئەم چینە ئەکتیڤەی کۆمەڵ لە مێژەوە زیندەوە و هاوارێتی لە دەستی ناعەدالەتی و دەیان جار وەك چینێکی بەش مەینەت لە قۆناغی بنەڕتی تا دەگاتە زانکۆ و پەیمانگاکان بۆ داوا کردنی حەقی خۆیان هاتونەتە سەر شەقام و توانیویانە کار لە گۆڕینی بڕیارەکانی حوکمەتدا بکەن بە جۆرێك چەندین جار روبەڕووی سوکایەتی و ئازار بوونەتەوە بەڵام ئەمان کۆڵیان نەداوە و شۆڕشێکی بێ چەکیان بە قەڵەم دەست پێ کردووە کە لە مێژووی کاری مەدەنیدا جێگەی خۆی گرتووە ، لە خۆپیشاندانە سەرەتایەکانی شۆڕشی گەلی کورد دژی رژێمی بەعس هەر قوتابیان بوون سنگیان دەنایە بەر گوللەی دژمنەوە بۆ بەدەست هێنانی مافی نەتەوەیەکی بێ کیان ، لە راپەڕینی بەهاری نەوەد و یەك هەر ئەوان بوون دەڕژانە سەر شەقامەکان و بلێسەی ئومێیان بە شۆڕ دەبەخشی لە ئێستایشدا و لە سایەی حوکمەتی کوردیدا هەر گەنجانی کەلار و هەڵەبجە و سلێمانی و رانیە و سۆران و تەواوی کوردستان بوون لە ساڵی ٢٠٠٥ و دواتر بۆ نەبوونی خزمەت گوزاری دەهاتنە سەر شەقام و داوای ئاو و کارەبا و بەنزینیان لە حوکمەتی خۆماڵی دەکرد بە دەخاوە ئەوسا و ئێستایش بە گوللە وەڵامیان دەدرایەوە و دەوترا "دەست لە پشتێتی " .





ئاماری شەهید و بریندارانی خۆپیشاندانەکانی پاش ١٧ی شوبات لە کوردستان سەلماندی کە جارێکی تر خوێندکاران پێشەنگ و رێبەرن بۆ بەدەست هێنانی ئازادی بۆ گەل و نەمانی ناعەدالەتی ، شەهید کردنی خوێندکاری خوار تەمەنی هەژدە ساڵ چ پاساوێك بۆ بکوژانی دێنێتەوە یان بڵێین لە بەردەم خوا و گەلدا چی بە خۆیان دەڵێن ، بەشداری بەرچاوی خوێندکاران لە قۆناغە جیاياکانی خوێندن بە تایبەت لە زانکۆ و پەیمانگاندا راستی ئەو شۆڕشە جەماوەرییە کە ئەو چینە زیندوە سەر مەشقێتی لەسەر شەقام بە گیان و بە خوێن .

لێرەوە حەق وایە رێکخراوە قوتابی و خوێندکاریەکان ئەوانەی کە خۆیان بە دەنگی ئەوان دەزانن بێنە دەنگ و نەهێڵن چی تر بە گوللەی کورد ئەو سەرمایە لە بن نەهاتوە دڵسۆزەی کورد بە هیچ خوێنیان نەڕژێت ، درود بۆ گیانی پاکی ئەو خوێندکارانەی کە بە خوێنی ئاڵیان گوڵی ئازادییان لە بەرۆکی ئەم شۆرشە جەماوەرییە خوێندکاریە دا کە تا ئەباد ناویان لە مێژووی پاکاندا دژی ناپاکان دەمێنێتەوە ، پێویستە نەك رێکخراوە خوێندکاریەکان بەڵکو وەزارەتی پەروەردە و رێکخراوەکانی مندالأنیش لەو رووە بێنە دەنگ و لێکۆڵینەوەی جدی دەست پێ بکەن و بە زوترین کات بە هەموان داوای خۆپیشاندانێکی هێمنانە و دوور کەوتنەوە لە قوتابی و خوێندکار کوشتن بکەین ؟

## مامۆستایانی ژن بە کەمی رۆژنامەکان دەخوێننەوە

مامۆستا وەك كارەكتەرێكی كارای كایەی رۆشنبیریی لە كۆمەڵگەی كوردیدا، پێویستە زۆربەی كاتی خۆیان بە خوێندنەوە بە تایبەت خوێندنەوەی رۆژنامەوە بەسەر ببەن، بە هۆی ئەوەی كە كارەكەیان وا پێویست دەكات. مامۆستایانی ژن یەكێكن لەو توێژانەی كە كەمتر گرنگیی بە خوێندنەوە دەدەن و وەكخۆیان نیشانەی بۆ دەكەن بە هۆی سەر قاڵییان بە ماڵ و منداڵەوە وا دەكات كە كەمتر گرنگی بە خوێندنەوە بدەن و سەرنوسەری رۆژنامەی ئامانجیش دەڵێت یان دەبێت مامۆستا واز لە مامۆستای بهێنێت یان دەبێت واز لە خوێندنەوە نەهێنێت.

مامۆستا هێرۆ ئەمین – مامۆستای بابەتە كۆمەڵایەتیەكان لە قۆناغی بنەڕەتی لە سنوری پەروەردەی گەرمیان، گرنگیدان بە خوێندنەوە هاوشانی خۆراكی گیان دەبینێت و پێیوایە خوێندنەوەی رۆژنامەكان بۆ فراوانكردنی ئاسۆی زانیاریەكانە بە تایبەت زانیاری نوێ و گەیاندنی بە قوتابیان. ئەو مامۆستایە خوێنەری بەردەوامی رۆژنامەكانی ژنان نیە، بەڵام وەكخۆی دەڵێت:"لە هەر یەك لەو رۆژنامانە بابەتێك سەرنج رابكێشێت





دەیخوێنمەوە بە تایبەت ئەو بابەتانەی كە تایبەتن بە بەسەرهات و باس لە كێشەكانی ژنان بە تایبەت توندوتیژیی دەكەن".

مامۆستا هێرۆ جەنجاڵیی ژیان و خۆخەریككردن بە بوارەكانی تری ژیانەوە، بە هۆكار لە دوور كەوتنەوەی ژنان لە خۆ دەوڵەمەند كردن بە "خۆراكی رۆح" كە خوێندنەوەیە، دەزانێت .

دنیا حەسەن، مامۆستای بابەتی زانستەكانە لە قۆناغی بنەڕەتیدا، خوێنەرێكی باشی رۆژنامەكانە، چونكە پێیوایە هەواڵی بەپێز و بابەتی هەمەڕەنگی گرنگی تێدایە، هاوشێوەی زۆربەی مامۆستایانی ئافرەت مامۆستا دونیاش خوێنەری بەردەوامی رۆژنامەكانی ژنان نیە و گرنگی بە رۆژنامەی گشتیی دەدات و ئەو رۆژنامانەش بە خستەڕووی كێشە و رێگە چارەكانی خەمەكانی ژنان دەزانێت. ئەو مامۆستایە سەیركردنی تەلەفزیۆن بە هۆكاری سەرەكی دەزانێت لە نەخوێندنەوەی رۆژنامەكان، وتیشی:" ئەگەر ئاسانكاریی بكرێت لە دەستكەوتنی رۆژنامەكان وگەیاندنی بە خەڵك لە ماڵەكانی خۆیان بێگومان خوێنەری رۆژنامەكان زیاتر دەبن".

ڤیان ئەحمەد، مامۆستای زمانی ئینگلیزیی لە قوتابخانەی شەهید مەلا ئەحمەدی بنەڕەتی، سەبارەت بە خوێندنەوە، وتی: " تا رادەیەكی زۆر حەزم لە خوێندنەوەیە بە تایبەت خوێندنەوەی رۆژنامەكانی ژنان، بەڵام زۆر دەستمان بە رۆژنامەكان ناگات بە

حوكمی ئەوەی ئێمە ئافرەتین و لە ماڵەوەین". ئەو خۆی بە خوێنەرێكی باشی رۆژنامەكانی ژنان دەزانێت هەر چەندە جار بە جار لێی دادەبڕێت و پێیوایە كە ئەو رۆژنامانە توانیویانە باس لە خەمەكانی ژنان بكەن هەرچەندە هەندێكجار هەندێك بابەت دەوروژێنن كە كێشەكانی ژنان زیاد دەكات.

مامۆستا ڤیان پابەندبوونی ژن بە ماڵ و خۆخەریك كردنی بە بەخێو كردنی منداڵەوە بە هۆكار دەزانێت لەوەی كە ژنان كەمتر گرنگی بە خوێندنەوە بدەن .

سەلام حسێن – وەك مامۆستایەكی پیاو و خوێنەری رۆژنامە و گۆڤارە كوردیەكان لە گەرمیان، بۆ خوێندنەوەی رۆژنامەكانی ژنان وتی:" من كەمتر رۆژنامەكانی ژنان دەخوێنمەوە، بە هۆی ئەوەی كە زۆر جار لە رۆژنامەكانی ژناندا ژنان خۆیان كەمینەو و زیاتر پیاوان بۆیان دەنوسن یان بە بڕوای من رۆژنامەكانی ژنان لە ئاست كێشەكانی ژناندا نین ". لەبارەی هۆكاری كەمخوێندنەوەی ژنان، ئەو مامۆستا پیاوە وای دەبینێت كە زیاتر هۆكارەكە كلتوریە كە ژنانی تێدا پەروەردە بووە و هۆكاری سەرقاڵ بوونی ژن بە ماڵ و بە خێو كردنی منداڵ بە هۆكارێكی تر دەزانێت بۆ ئەم پرسە.

سیامەند كەریم – خاوەنی كتێبخانەی خاك بۆ فرۆشتنی رۆژنامە و گۆڤار و كتێب لە كەلار، ژمارەی خوێنەری مامۆستایانی ژن لە





شارەكەدا لە پەنجەكانی دەست بە كەمتر دەزانێت و ئەمەیش بۆ هۆكاری نا رۆشنبیریان دەبینێت " كە دێنە ئێرە بە تایبەت قوتابیە كچەكان لە لایەن زانكۆوە ناچار كراون كە كتێبێك بكڕن بۆ توێژینەوە یان كە بە ویستی خۆیان هاتن زیاتر رۆژنامە و كتێبە هەمەڕەنگەكان دەخوێننەوە". سەبارەت بە بردنی رۆژنامە و گۆڤار بۆ ماڵان كە هەندێك مامۆستای ژن داوای دەكەن، خاوەنی ئەو كتێبخانەیە ئامادەیی دەر دەبڕێت و دەڵێت:" گەر ژمارەیان زۆر بێت بەو كارە هەڵدەستین" .

رۆژنامەنوس شیلان محەمەد، تا ئەو رادەیەی كە ئاگای لە توێژی مامۆستایانی ژن هەیە، لە قوناغی بنەڕەتی و ئامادەیی هاوڕێتی ئەوان لەگەڵ خوێندنەوەدا زۆر بە كەمی دەبینێت و پێیوایە مامۆستایان تەنها ئەو مەنهەجە دەخوێننەوە كە بە خوێندكاری دەڵێنەوە و هەندێك لە مامۆستایان زۆر نامۆن بە كولتوری خوێندنەوە، هاوكات نیشانە بەوەیش دەدات كە رێژەیەكی كەم لە مامۆستایان كە لە رێكخراوەكان و ناوەندە رۆشنبیریەكاندا كار دەكەن، دەخوێننەوە. ئەو رۆژنامەنووسە میكانیزمی دابەشكردنی رۆژنامە لە كوردستاندا كە بە دەست خوێنەر ناگات بە هۆكارێك دەزانێت بۆ كەمتر خوێندنەوەی رۆژنامەكان بە تایبەت ئەوانەی كە تایبەتن بە ژنان و زۆر بە كەمی ئەو رۆژنامانە دەستی ژنان دەكەون " بە گشتی من نازانم

رۆژنامەکانی ژنان بۆ کێ دەنوسن و دەیانەوێت کێ بیانخوێتەوە، چونکە بە کەمی دەچنە ناوەندەکانی خوێندن چ قوتابخانە چ زانکۆ چ بەشە ناوخۆیەکانی کچان ".

شیلان محەمەدی رۆژنامەنوس، نیشانە بۆ ئەوەیش دەکات بە هۆی ئەوەی کە رۆژنامەکان کەمتر باس لە خەمەکانی مامۆستایانی ژن و کێشەکانیان دەکەن، یان بە هۆی نەبوونی ناویان لە نێو ئەو رۆژنامانەدا وا دەکات کە کەمتر مامۆستایان گرنگیی بە خوێندنەوەی بدەن .

مامۆستا عومەر محەمەد ئەمین- سەرنوسەری رۆژنامەی ئامانج - زمانحاڵی یەکێتی مامۆستایانی کوردستان، بەمشێوەیە بۆ ئەم پرسە بۆچونی خۆی خستە روو: " نەخوێندنەوەی رۆژنامە و گۆڤارەکان تەنها چینی مامۆستای نەگرتوەتەوە، بەڵکو توشی زۆرێك لە چینەکانی کۆمەڵگە بووەتەوە، تەنانەت لە نێو چینی رۆشنبیرانیشدا"، وتیشی:" لە کۆندا کە کتێبێك دەر دەچوو یەکسەر لە بازاڕدا نەدەما و ئێستا زۆرترینی رۆژنامەکان بۆ سفرە بەکار دەهێنرێت ". سەرنووسەری رۆژنامەی ئامانج بە مەحاڵی دەزانێت کە مامۆستا نەخوێنێتەوە، چونکە ئەو نەوەکان پێدەگەیەنێت کە ئەمەیش پێویستی بە زانیاریی و خوێندنەوەی بەردەوام هەیە "چونکە ناکرێت مامۆستا نەزانێت سیستەمی پەروەردەی ئەمڕۆ لە دنیا بەرەو چ ئاراستەیەك دەڕوات".



پەروەردەو فێربوون، گرفت و گۆڕان

مامۆستا عومەر محەمەد رایدەگەنێت کە یان دەبێت مامۆستا واز لە مامۆستای بهێنێت یان دەبێت واز لە خوێندنەوە نەهێنێت.

لەبارەی هەوڵەکانی یەکێتی مامۆستایان وەك رێکخراوێکی پەیوەندیدار بە مامۆستایان و بوونی پرۆژەیان لەو رووەوە، وتی " ئێمە ئاشتبوونەوەی مامۆستامان لە یەکێتی مامۆستایان زوو راگەیاندووەو زۆربەی لقەکانیش سەنتەری رۆشنبیریی و کتێبخانەی تێدایە، بۆ نمونە: لە لقی سلێمانیدا باشترین کتێبخانە هەیە". ئەوەیشی ئاشکرا کرد کە لە دوای کۆنگرەی مامامۆستایان کار بۆ ئەوە دەکەن کە نەك تەنها لە شارە گەورەکان، بەڵکو لە قەزا و ناحیەکان سەنتەری رۆشنبیریی بکرێتەوە "بۆ ئاشتکردنەوەیەکی سەرتاسەریی مامۆستایان و خوێندنەوە".

<u>تێبینی : ئەم راپۆرتە لە گۆڤاری هەفتانەدا بڵاو کراوەتەوە</u>

### بەرنامەی بەرەو پەروەردەیەکی هاوچەرخ لە رادیۆی تەوار لە کەلار

رادیۆی تەوار بە هاوکاری بەڕێوەبەرایەتی گشتیی پەروەردەی گەرمیان، بەرنامەی (بەرەو پەروەردەیەکی هاوچەرخ) ی دوو هەفتە جارێك بە راستەوخۆیی لە رۆژانی یەکشەممە پێشکەش کردووە و بۆ هەفتەی دواتر دووبارە بووەتەوە، بۆ ماوەی دوو ساڵ کە تێکرا بیست و یەك ( ٢١ ) ئەڵقە بووە.

لە ساڵی یەکەمی بەرنامەکەدا لە مانگی ( تشرینی دووەمی ٢٠٠٧ – ئایاری ٢٠٠٨ ) پێشکەش کراوە کە لەو ماوەیەدا نۆ ( ٩ ) ئەڵقە لەبەرنامەکە بە بەشداریی کەسانی شارەزاو پسۆڕیی پەروەردەیی پێشکەشکراوە کە تێیدا ٢٥ گوێگر کە لە قوتابی و مامۆستا و بەخێوکەران و هاوڵاتیان پەیوەندییان بە بەرنامەکەوە کردووە. لە ساڵی دووەمی بەرنامەکەدا لە (ئەیلولی ٢٠٠٨ – نیسانی ٢٠٠٩ ) پێشکەشکردووە کە ئەویش دوانزە (١٢) ئەلقە لەبەرنامەکە پێشەکەشکراوە کە ( ٢٥ ) پەیوەندی تەلەفۆنی بە بەرنامەکەوە کراوە کە ئەم بەرنامەیە لە ئامادەکردنی راوێژکاری پەروەردەی رادیۆی تەوار (مامۆستا سەباح عەلی جاف) بووە .





### تەوەرەکانی بەرنامەی بەرەو پەروەردەیەکی هاوچەرخ بۆ ساڵی خوێندنی ٢٠٠٧ – ٢٠٠٨

| ژ | تەوەری بەرنامە | میوان | پ | مانگ | تێبینی |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | فەلسەفەی پەروەردە و فێربوون | م . سالار حسین ی.ب.گ.پ.گەرمیان | ٢ | ١١ | |
| ٢ | گۆڕان لە تاقیکردنەوە و پشووەکان | م . حمە سعید محمد سەرپەرشتیاری پەروەردەیی | ٤ | ١ | |
| ٣ | گرفتەکانی پەروەردە لە گەرمیان | م . عەبدوڵلا حەسەن سەرپەرشتیاری پەروەردەیی | ٤ | ١ | |
| ٤ | باخچەکانی ساوایان و پەروەردە | م . خالد مەحمود سەرۆکی ب. باخچەی ساوایان لە پ . کەلار | - | ٢ | بەتەلەفۆن ب.باخچەی ساوایانی کەلار بەشدار بوو |
| ٥ | پرۆگرام و پەروەردە | م . کەریم حەقمراد سەرپەرشتیاری پەروەردەیی | ٥ | ٢ | |
| ٦ | پەروەردەی هونەر لە قوتابخانەکاندا | م . ناميق عەلی سەرپەرشتیاری پەروەردەی هونەریی | ١ | ٣ | |
| ٧ | پەروەردە و ئەنفال | م . ئیبراهیم سەرپەرشتیاری پەروەردەیی | ٢ | ٤ | (گرمیان حمە خان) پێشکەشی کرد بە هۆی نەخۆش |

| ژ | تەوەری بەرنامە | میوان | پ | مانگ | تێبینی |
|---|---|---|---|---|---|
| | | | | | کەوتنی م . سەباح |
| ٨ | تاقیکردنەوەکان | جوبرائیل حەمە سالح سەرپەرشتیاری پەروەردەیی | ٦ | ٤ | |
| ٩ | مافی مرۆڤ و پەروەردە | م . سەرحەد محەمەد توێژەری کۆمەڵایەتیی | ١ | ٥ | |





## تەوەرەکانی بەرنامەی بەرەو پەروەردەیەکی هاوچەرخ بۆ ساڵی خوێندنی ٢٠٠٨ – ٢٠٠٩

| ژ | تەوەری بەرنامە | میوان | پ | مانگ | تێبینی |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | ئامادەکاری ساڵی تازەی خوێندن لە گەرمیان | م . مستەفا رەشید ب.گ.پ. گەرمیان | ٥ | ٩ | |
| ٢ | پەیوەندی نێوان مامۆستا و سەرپەرشتیار | م . کەریم مەجید ب. سەرپەرشتیاری پەروەردەیی ئامادەیەکان | – | ١٠ | |
| ٣ | ژینگەی قوتابخانە و پەروەردەی نوێ | م . سەرحەد محەمەد توێژەری کۆمەڵایەتی | – | ١٠ | |
| ٤ | خوێندنی گەورە و نائاسایی لە گەرمیان | م . شکور محەمەد بەڕێوەبەری خوێندنی نائاسایی لە گەرمیان | ٢ | ١١ | |
| ٥ | دانەمەزراندنی مامۆستایان و وەرنەگرتنی خوێندکاران لە | بیستون ئەحمەد مامۆستای دانەمەزراو، پشتیوان حەمە خان | ١ | ١١ | بەرنامەکە بە دوو تەوەر پێشکەش کرا و بە جیا ئەو تەوەرانە قسە |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| | گەرمیان | خوێندکاری وەرنەگیراو لە زانکۆ | | | باسی لەسەر کرا . |
| ٦ | دیداری گەشە | م . حمە سعید محمد سەرپەرشتیاری یەکەمی پەروەردەی | – | ١١ | |
| ٧ | خوێندنی پیشەیی لە گەرمیان | م . ئەنوەر محەمەد سەرۆکی بەشی کارەبا لە ئامادەیی کەلاری پیشەیی | – | ١ | |
| ٨ | کۆنگرەی پەروەردەی وەرزش و پەروەردەی وەرزش لە گەرمیان | م . خۆشناو حەسەن بەڕێوەبەری چالاکی وەرزشیی لە پەروەردەی گەرمیان | – | ١ | لەم بەرنامەیەدا ڕاپۆرتێکی تێروتەسەل سەبارەت بە ناوەڕۆکی کۆنگرەکە خرایە روو |
| ٩ | پێکەوە خوێندنی کوڕان و کچان لە ناوەندەکانی خوێندندا | م . ئیسماعیل سەمین سەرپەرشتیاری پسپۆریی کۆمەڵایەتیی | ١ | ٢ | |
| ١٠ | مامۆستا لە گەرمیان و پەروەردەی نوێ | م . دارا ئەحمەد ب. لقی گەرمیانی یەکێتی مامۆستایان | ٣ | ٢ | |





| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ١١ | توندوتیژی لە پەروەردەدا | م . سالار حسێن ی. ب.گ.پ.گەرمیان | ٥ | ٣ | |
| ١٢ | تاقیکردنەوەی میللی و گۆڕانکاری لە تاقیکردنەوەکانی ئەمساڵدا | م . سەرحەد محەمەد بەڕێوەبەری ئەزموونەکان لە پەروەردەی گەرمیان | ٨ | ٤ | |

**تێبینی** : ئەمە هاوپێچی نوسراوێکی رادیۆی تەوارە کە ئاراستەی پەروەردەی گەرمیان کراوە .ئەم بەرنامەیە یەکەمین بەرنامەی پەروەردەییە کە لە راگەیاندنەکانی گەرمیاندا پێشکەش کراوە.

له گەرمیان ٪٤١ ی منداڵانی کوڕ و ٪ ٣٥ ی کچانی منداڵ له ماڵەوه توندوتیژییان دژ بەکار هێنراوه

**بەکارهێنانی توندوتیژیی دژی مناڵان له نێو خێزان و کۆمەڵگەدا بەردەوامە و به پێی راپرسیەکی تۆڕی پاراستنی منداڵانی گەرمیان له ٪٤١ ی کوڕان و له ٪ ٣٥ ی کچان له ماڵەوه توندوتیژییان دژ بەکار هێنراوه، بەڕێوەبەری ئۆفیسی گەرمیانی رێکخراوی لانەی منداڵانی کوردستانیش ئاماژه بەوه دەدات که ئەوان هەوڵیان هەبووه بۆ کەمکردنەوەی توندوتیژیی دژی مناڵان له سنورەکه و بەڕێوەبەری گشتی پەروەردەی گەرمیانیش ئاشکرای دەکات هەر مامۆستایەك توندوتیژیی بەکار بهێنێت یان دار له مناڵ بدات یان وشەی ناشرین بەکار بهێنێت، دوای لێکۆڵینەوه به پێی یاسا مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت.**





**٪ ٥١ ی مامۆستایانی گەرمیان ئەمساڵ توندوتیژ و لێدانیان بەرامبەر به قوتابیان بەکارهێناوه**

**سەیوان عوسمان – وتەبێژی تۆڕی پاراستنی منداڵانی گەرمیان، رایگەیاند:" بۆ ماوەی هەژده رۆژ هەستاین به ئەنجامدانی راپرسیەك له چەند جێگەیەکی سنورەکه و سێ جۆر فۆرممان بەسەر هەریەکه له منداڵان و دایك و باوك و مامۆستایان دابەشکرد که بۆ هەر یەکه لەوانه ١٠٠٠ فۆرم بووه، دواتر ٩٧٦ فۆرمی منداڵان و ٧٤٤ فۆرمی بەخێوکەران و ٨٩٩ فۆرمی مامۆستایان گەڕێنراوەتەوه". لەبارەی ئامانجیان له راپرسیەکه ئاشکرای کرد که خۆی له هەریەکه له دەرخستنی داتایەك لەسەر توندوتیژیی و لێدان بەرامبەر به منداڵان و دانانی میکانیزمێك بۆ چارەسەرکردنی جۆرەکانی توندوتیژیی لەگەڵ نەهێشتنی کەلتوری توندوتیژیی و هەروەها خستنەرووی مافەکانی منداڵاندا دەبینێتەوه.**

**وتەبێژی تۆڕی پاراستنی منداڵانی گەرمیان بۆ بەشێك له ناوەڕۆك و دەرئەنجامەکان، بەم شێوەیه دوا:" له راپرسیەکەدا ٤٥٤ مناڵی کوڕ بەشدار بوونه که وەڵامی هەندێك له پرسیارەکانیان بەم جۆره داوەتەوه: (ئایا له ماڵەوه توندوتیژیی یان لێدان بەرامبەرت بەکارهاتووه ؟ بەڵێ ٤١٪ ، نەخێر ٥٩٪ یان پرسیومانه کێ له ماڵەوه زیاتر توندوتیژه و لێدان**

بەکاردەهێنێت ؟ دایك ٥٪ ، باوك ١٨٪ هەردووکیان ٤٥٪ ، خوشك وبرا ٣٢٪ لە وەڵامی پرسیارێکی تردا هاتووە ئایا لە قوتابخانە توندوتیژیی یان لێدان بەرامبەرت بەکارهاتووە ؟ بەڵێ ٦١٪ ، نەخێر ٣٩٪ ) .

وتیشی: هەر لەو ڕاپرسیەدا ( ٥٢٢) منداڵی کچ بەشدار بوونە کە وەڵامی هەندێك لە پرسیارەکان بەم شێوەیە بووە: (ئایا لە ماڵەوە توندوتیژیی یان لێدان بەرامبەرت بەکارهاتووە؟ بەڵێ ٣٥٪ ، نەخێر ٦٥٪ ). یان پرسیومانە: (کێ لە ماڵەوە زیاتر توندوتیژە و لێدان بەکاردەهێنێت ؟ دایك ١٨٪ ، باوك ١٥٪ ، هەردووکیان ٤٠٪ ، خوشك وبرا ٥٠٪ ). لە وەڵامی ئەو پرسیارەی ئایا لە قوتابخانە توندوتیژی یان لێدان بەرامبەرت بەکارهاتووە ؟ ( بەڵێ ٥٦٪ ، نەخێر ٥٤٪ ).

سەیوان نیشانەی بۆ ئەوەیش کرد کە هەریەکە لە دایك و باوك و مامۆستایانیش وەڵامی پرسیارەکانیان داوەتەوە کە لە فۆرمی ڕاپرسیەکەدا ئاراستەیان کراوە، وتیشی: ئەوەی کە تێبینی کراوە لە ٪ ٥١ ی مامۆستایانی بەشدار بوو ئەمساڵ توندوتیژیی و لێدانیان بەرامبەر بە قوتابیان بەکارهێناوە و لە ٪ ٣٩ ی باوکانیش لەماڵەوە توندوتیژیی یان لێدانیان بەرامبەر بە منداڵەکانیان بەکارهێناوە و لە ٥٥ ٪ ی دایکانیش لەماڵەوە توندوتیژیی یان لێدانیان بەرامبەر بە منداڵەکانیان کردووە.



پەروەردەو فێربوون، گرفت و گۆڕان

بۆ زیاتر تیشك خستنە سەر توندوتیژیی و کاریگەری و هۆکارەکان و کارکردنی ڕێکخراو و دەزگاکانی منداڵان و ڕای وەزارەتی پەروەردە بۆ توندوتیژی بە چەند بۆچونێك چەند ڕەهەندێکی توندوتیژیی دژی منداڵان دەخەینە ڕوو .

ڕێکخراو و دەزگاکانی منداڵان وەك پێویست نەیانتوانیوە توندوتیژیی کەمبکەنەوە

شیرین مەحمود – بەڕێوەبەری ئۆفیسی گەرمیانی لانەی منالأنی کوردستان، هەریەکە لە خودی منالْ و خێزان و کۆمەڵگە بە فاکتەر دەزانێ بۆ هۆکاری توندوتیژیی دژی منالأن کە ژینگە کاریگەری ڕاستەوخۆی هەیە، نیشانەی بۆ ئەوەیش کرد کە هەریەکە لە دایك و باوك و مامۆستا، گرتنەبەری توندوتیژیی بە ڕێگەی گوێڕایەڵی منالْ بۆ ئەنجامدانی کارێك دەبینن .

بەڕێوەبەری ئۆفیسی گەرمیانی لانەی منالأنی کوردستان، لەبارەی کاریگەریی دایك بۆ حاڵەتی توندوتیژیی، باس لەوە دەکات کە کەیسیان لایە دایك جیاکاری لە نێوان منالەکانیدا دەکات، ئەمەیش وا دەکات کە توندوتیژیی لە خێزاندا زیاد بکات. دەربارەی کارکردنی ڕێکخراوەکەیان بۆ کەمکردنەوەی توندوتیژیی، شیرین وتی:"ڕاستە وەکپێویست نەمانتوانیوە لەو

رووەوە کار بکەین، بەڵام چەندین کۆڕ و سیمینار و بەرنامەی رادیۆییمان هەبووە بۆ باس کردن لە حاڵەتەکان، بەڵام ئایا دەگاتە جێگەی خۆی؟" جەختیشیکردەوە "ناتوانین لەم وڵاتە توندوتیژیی بنەبڕ بکەین" .

خانەی شێروانە بۆ رۆشنبیریی منداڵان، یەکێکی ترە لە دەزگا حوکمیەکانی سنورەکەو کار بۆ منداڵان دەکات. لە پەیوەندیەکدا بەو دەزگایە سەبارەت بە کارکردنی ئەوان بۆ کەمکردنەوەی توندوتیژی دژی منداڵان ، بەڕێوەبەری ئەو خانەیە بە هۆی نەبوونی سەلاحیاتەوە رونکردنەوەی پێنەداین "بە هۆی نەبوونی سەلاحیاتەوە ناتوانین کار لەسەر ئەو شتانە بکەین و کاری ئێمە تەنها هۆشیاری و بڵاوکردنەوەی مافەکانی منداڵانە". بە پێی زانیاریەکان ئەو خانەیە لە وەزارەتی رۆشنبیریەوە پێیان وتراوە کە کاری لەو شێوە نەکەن و سەردانی زیندانیەکانی منداڵان نەکەن، چونکە لە پەیڕەوویاندا کاری لەو شێوەیە نەهاتووە و ئەوان دەزگایەکی حکومیین .

هەر مامۆستایەك توندوتیژیی بەکار بهێنێت پێی یاسا مامەڵەی لەگەڵ دا دەکرێت

ئەحمەد عەلی – مامۆستای قوناغی بنەڕەتی لە کەلار پێیوایە تەنها بە قسەکردن و بڕیار بەکارهێنانی توندوتیژیی، بنەبڕ



پەروەردەو فێربوون، گرفت و گۆڕان

ناکرێت. پێشیوایە "بە هۆی گەشەنەکردنی ئاستی پەروەردەیی خێزانەکان و کەموکورتی لە کەرتی پەروەردە وەك کەمی بینا و زۆری قوتابی و کۆنیی زانیاریەکان لەلای مامۆستا و نەکردنەوەی خولی کاریگەر بۆ مامۆستایان، وایکردووە کە تائێستایش لە لایەن مامۆستایانەوە توندوتیژیی بەکار بهێنرێت".

لە بەرامبەردا مامۆستا مستەفا رەشید – بەڕێوەبەری گشتیی پەروەردەی گەرمیان، رایگەیاند:" بە پێی تەعلیماتی وەزارەتی پەروەرەردە بە هەموو شێوەیەك توندوتیژیی دژی قوتابیان قەدەغەیە و ئەگەر هەر مامۆستایەك توندوتیژیی بەکار بهێنێت یان دار لە منداڵ بدات یان وشەی ناشرین بەکار بهێنێت، ئێمە دوای لێکۆڵینەوە بە پێی یاسا مامەڵەی لەگەڵ دا دەکەین و تا ئێستا هیچ حاڵەتێکی لەو شێوەیە نەهاتوەتە لای ئێمە و ئەو بابەتە لە پەروەردەدا لە ئێستادا بە هەند وەردەگرێت". ناوبراو ئاشکراشی کرد سەلمێنراوە کە لێدان و توندوتیژیی، منداڵ پەروەردە ناکات و بەدیلی توندوتیژیی لە قوتابخانەدا زۆرە، بۆ نمونە: دەتوانرێت منداڵ لە چالاکیە هونەریی و وەرزشییەکان بۆ ماوەیەك بێبەش بکرێت یان دایك و باوکی بانگ بکرێت و وتوێژی لەگەڵ بکرێت .

**بەڕێوەبەری گشتیی پەروەردەی گەرمیان وتیشی:" لە بەرنامەدایە کە بینای باش بۆ قوتابخانەکان درووست بکرێت ، ئەمەیش هۆکارێك دەبێت بۆ کەمکردنەوەی توندوتیژیی دژی قوتابی"، هەروەك رێنمایی مامۆستایان دەکات کە خۆیان لە توندوتیژیی دژی منالّ بە دوور بگرن و منالّ پەروەردە بکەن ئینجا هۆیەکانی فێرکردن بگرنەبەر.**

**<u>تێبینی: ئەم راپۆرتە لە گۆڤاری هەفتانەدا بلاّوکراوەتەوە</u>**